# کولتوور و فەرهەنگی کوردی

پرۆفیسۆری یاریدەدەر

د. هیمداد حوسێن



هەولێر ٢٠٠٩



دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **کولتوور و فەرهەنگی کوردی**
- نووسینی: د. هیمداد حوسێن
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن
- بەرگ: موراد بەهرامیان
- ژمارەی سپاردن: (٢٦٨١)
- نرخ: (٢٥٠٠) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠٠٩
- تیراژ: ٧٥٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

**زنجیرەی کتێب (٣٦٤)**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# پێرست

# دەسپێك..

لە ماوەی بیست ساڵی رابردوودا، چ وەکو ئارەزووی خۆم و چ وەك پێویستیی قۆناغەکانی خوێندنی باڵا پێوەندی و ئاشناییم لەگەڵ رۆژهەڵاتناسی و ئەو سەرچاوە مێژووییانەی لەبارەی کوردەوە نووسراون، پەیدا کرد.

سەرباری وەرگێڕانی ژمارەیەك وتار لەو بوارەدا، هەند جار بۆ خۆیشم لە کاتی خوێندنەوەی ئەو سەرچاوانە و رۆڵی هەندێ لەو ئەفسەر و کوردناسانەدا لە بوارەکانی رۆژنامەنووسی و یاداشتەکانیان لەمەڕ کلتووری کوردەوە، سەرنج و تێبینیم لەکن گەڵاڵە ببوو، هەندێکیان لە کاتی خۆیدا لە رۆژنامە و گۆڤارەکانی کوردیدا بڵاوکراونەتەوە، بەڵام بە هۆی هەوراز و نشێوی رۆژگاری بزاڤی رزگاریخوازیی کورد و باری سیاسییەوە، من و زۆری وەکو من، ئەگەر ئەورۆ بمانەوێ ئەو نووسینانەی خۆمان دەست کەوێتەوە، بە زەحمەت چنگمان دەکەوێتەوە و کتێبخانەی کوردییش ئەوەندە رێك و پێك نییە، بە سانایی بۆی بگەڕێیتەوە، هەر بۆیە لە لای خۆمەوە بڕیارمدا، ئەوەندەی لەبەر دەستمدان با ئەو وتارە رۆژنامەنووسییانەی کە لە بابەت کلتوور و فەرهەنگی کوردییەوە نووسیومن لە نامیلکەیەکدا کۆیان بکەمەوە و ئەم هەوڵەش هەنگاوێك بێت بۆ ئاییندەیەکی رۆشنتر و ئەم دیارییە سادەیەش قەبووڵ بفەرموون..

**نووسەر**

## گرنگی کوردناسی:

گەڕۆکە ئینگلیزەکان ئەگەر وەکو هەندێ گەڕۆکی تری ئەوروپایی، لە هەندێ راپۆرت و کتێب و گوتاراندا قسەی نابەجێ و تیر و توانجیان لە کورد گرتبێ، یان لە روونکردنەوەی چەند لایەنێکی ئەتنۆگرافیدا بە سەهوو چووبن و تەواو راستییان نەپێکابێ، رەنگە زیاتر لەبەر تەواو حالی نەبوون و تێ نەگەیشتنەوە بێت. نەوەکو بە ئەنقەست و دوژمنایەتی و لە ناحەزییەوە بێت، چونکە ئەو گەڕیدە و کوردناسانە ئەوەندەی لە بەرژەوەندییاندا نەبووە، هۆی گەڕاندنەوەی زمانی کوردی بۆ بنەچەی زمانی فارسی و چەتە و رێگری و نەزانین و پیاوکوشتنی لادێیی کورد لەبەر مەرایی کردن بێ  بۆ بەریتانیای مەلەکی یان بەریتانیای گەورە، بەڵکو هەر ئەوەیە مرۆڤ پەیوەندە بەچەندین بنەمای کۆمەڵایەتی و فەرهەنگی و ئایینی و مێژووییەوە، کە هەموو ئەوانە جیاوازی شارستانیەتەکان و کۆمەڵگاکانی مرۆڤ لە ژیاندا پێك دەهێنن و هەستی ناحەزی و بێگانەیی و نامۆییان لە لا دەخولقێنێ.

کۆمەڵی کوردەواری چەند سەدەیەك بەر لە ئەمڕۆ لە هەموو روویەکەوە دەگەڵ کۆمەڵی کوردەواری ئەمڕۆ هەرگیز وەك یەك نییەو بەراورد ناکرێت. جا لە کرۆکی نووسینی ئەو گەڕیدە و کوردناسانە شتی عاجباتی دەبینرێ، نابێ بەشتێکی سەیر دابنرێت. گەڕیدەیەك رێی کەوتۆتە گوندێکی ناو ئەو چیایانە، یان شەوێك میوانی رەشماڵنشینێك بووە، بێگومان جۆری ئەو ژیانەی ئەوان و رەوشت و ئایین و



بیرکردنەوەیان بەو نامۆیە و بەهەڵسوکەوتی مرۆڤی سەرەتایی لە قەڵەم دەدات، بەڵام دەبێ چاك درك بەو راستییە بکەین، کە ئەو گەڕیدە و کوردناسانە هەرچییەکیان لەسەر کورد نووسیبێ، بەچاك و بەخراپ، ئەورۆکە بۆ ئێمە سەرچاوەیەکی گەورەیە و بوونەتە سەرچاوەیەك بۆ نەوەی ئەمڕۆ تا بەهەڵە و پێداهەڵگوتنەکانی ئەواندا بچینەوە و پەند و ئامۆژگاری لێوەرگرن. لە کاتێکدا ئەوان بە کوردستاندا گەڕاون و ئەو شتانەیان نووسیووە، لە هەموو کوردستاندا بەتەنێ مەلا و فەقێیەکان خوێندەوارییان هەبووە، ئەوانیش شرە عارەبییەکیان زانیوە و پێیان خەوشی و نەنگی بووە بە زمانی کوردی بنووسن.

ئێمە ئەگەر بمانەوێ باشتر و چاکتر بۆ مەسەلەکە بچین، دەبێ هەوڵی ئەوە بدەین نووسینەکانی ئەوان یەکلا بکەینەوە و هەڵە و ناتەواوییەکان راست بکەینەوە، بە شێوەیەکی زانستی نەوەکو خەتێکی راست و چەپ بەسەر کتێبی کابرای بێگانەدا بێنین، چونکە کوردی بە وەحشی و ئاژەڵ داناوە.

بەڵێ، رەنگە رۆژهەڵاتناسێك بەقەد کوردێك شارەزای فۆلکلۆر و کەلەپووری کوردی نەبێت و تێیدا قووڵ نەبووبێتەوە، بەڵام خۆ هیچ نەبێ لە رێگەی ئەوانەوە دەیان و سەدان هەقایەت و بەیت و پەندی پێشینان و ئەفسانە و داب و نەریتی کوردەواری ئەو سەردەمانە تۆمارکراوە و لە فەوتان رزگار کراوە، چەندین دەستنووسی بەنرخی ئایینی و مێژوویی و ئەدەبی بەهەوڵی ئەوان پارێزراوە. بۆیە لێکۆڵینەوە لە بەرهەمی ئەو گەڕیدە و کوردناسانە، بەردی بناغەیە کە بۆ خۆناسینی زیاتر و هەنگاوێکی بەلەزە بۆ بەرەو پێشەوە بردنی رەوتی رزگاری نەتەوەیی و تێگەیشتن لە هەست و بیروڕای(بەرامبەر).

## کوردناسی لە نەزەری چەند گەڕیدەیەکی ئینگلیزەوە:

ئەگەر سەرنجێکی مێژوویی بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان و کات و دوای شەڕ بدەین، زوو بەزوویی هەوڵ و تەقەللای ئینگلیز و ئەڵمان و رووس و فەڕەنسا و

ئەمریکامان بۆ دەردەکەوێت، کە بە هەموو هێز و توانایەکەوە تێکۆشاون لە پێناو جێ پێ قایمکردنی خۆیان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

دیارە (کوردستان)یش بە هۆی شوێنی ستراتیژی لە ناوچەکەدا سەرنجی ئیمپریالیزمی جیهانی راکێشاوە، بۆ ئەوەی ببێتە بازاڕێکی گەورە بۆ ساغکردنەوەی کەلوپەلەکانیان و دەسکەوتنی کەرەسەی خاو، بەتایبەتی نەوت، هەموویانی شێت و شەیدا کردبوو، کە بەردەوام تێبکۆشن بۆ مانەوەیان، تەنانەت دوو بەرەکییەکی زۆریشیان کەوتبووە نێوانەوە. بەر لە دەستپێکردنی جەنگ، زانا و گەڕیدە رۆژئاواییەکان بەسەر زۆربەی ناوچەکاندا بڵاوببوونەوە.

گەشتەکانی(ج. مۆرگان) بۆ کەرکووك و خانەقین و کرماشان و نوێنەری تایبەتی ئەدمیراڵ چیستەر بۆ تورکیا و چەندین گەشتی ئەندازیار و پسپۆڕەکانی دی هەموویان عەودالّی کۆکردنەوەی زانیاری سەبارەت بە کوردستان بوون.

لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا ئەڵمانەکان بەر لە هەمووان کەوتبوونە خۆ، (لە کۆتایی سەدەی نۆزدەوە رۆژبەرۆژ دەسەڵاتیان لە تورکیادا بەهێزتر دەبوو بایەخێکی یەکجار زۆریان بە دروستکردنی خەتی شەمەندەفەر لەم وڵاتەدا)[1].

لە هەمانکاتدا ئینگلیزەکان بایەخێکی تایبەتییان بە کوردستان و بەتایبەتیش کوردستانی باشوور دەدا، چونکە هەموو بەرژەوەندییەکی خۆیان لەوێدا دەدۆزییەوە، رەنگە ئەوەش یەکێك لەو هۆکارانە بێت کە گەڕیدە و رۆژهەڵاتناسە ئینگلیزەکان گەڕان و سەردان و کتێبەکانیان بۆ ئەو ناوچەیە تەرخان کردبێت و چەندین زانیاری بەکەڵکیان لە رووی جوگرافیا و ئەتنۆگرافیا و زمان و مێژووی ئەو ناوچەیە بۆ ئێمە بەجێهێشتبێت.

رەنگە سەرەتای رۆژهەڵاتناسە ئینگلیزەکان لە گەشتەکەی دکتۆرێکی کۆمپانیای هیندی رۆژهەڵاتی و کاربەدەستانی ئەو کۆمپانیایە(د. کامپبیل، ت. هاول و

(١) د. کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، بەغدا، ١٩٧٥، ل ٦-٧.



هیتر[2]ەوە بۆ کوردستان دەستی پێکردبێ، بەڵام ئەو گەڕیدەیەی بەڕاستی کوردناسی لە ئەنجامی گەشتەکەیدا بووە حەزێك و خۆی پێوە خەریك کرد (سۆن) E.B.Soane بوو، ئەو پیاوە چەندین کتێبی بە کەڵکی لەمەڕ زمان و رێزمان و فۆلکلۆری و یاری و ئەتنۆگرافیای کورد نووسیووە، کە لە نێو جیهانی کوردناسیدا پلە و پایەیەکی بەرزیان هەیە. ئەمە هەندێك لە بەرهەمەکانییەتی:

-Kurdish Grammar (Grammar of the Kurmanji of Kurdish Language),(London,1913.

-Elemantary Kurmanji grammer(Sulaimania district), Baghdad,1919.

- A southern Kurdish folk song in Kermanshani dialect'' Journal of the Royal Asiatic Socirty'', 1909, January, Pt.I.PP.35-51.

- Notes an a Kurdish dialect, Sulaimania (Southern Turkish Kurdistan)

- Notes on The Phonology of southern Kurmanji.

(سۆن) زۆربەی ناوچەکانی کوردستان گەڕاوە و سەرەتا لە شاری کرماشان لە ئێران فێری زمانی فارسی و کوردی بووە و شارەزایی لە زۆربەی شێوەزارەکانی زمانی کوردیدا هەبووە و ماوەیەکی زۆر لە کرماشان و سنە و سلێمانی و خانەقیندا ماوەتەوە و پەیوەندییەکی پتەوی لەگەڵ سەرانی کورد و بەتایبەتی ئێلی جافدا هەبووە و ماوەیەکیش لەماڵی عادیلەخانمی هەڵەبجەدا ماوەتەوە.

(٢) کەمال مەزهەر ئەحمەد، کوردستان لە ساڵەکانی شەڕی یەکەمی جیهانیدا، بەغدا، ١٩٧٥، ل١٣.

لە پەرەگرافێکی کتێبەکەی

(To Mesopotamia and Kurdistan in Disguise)دا بەم شێوەیە وەسفی عادیلە خانمی کردووە:

( هەرچی کاروباری هەڵەبجە و ئەو ناوە هەیە هەمووی بە دەست (عدلەخان)ە و (محکمە)یەکی داناوە خۆی سەرکردەیەتی (حبس خانە)یەکیشی دروست کردووە، لە ئێرانەوە بەننا و وەستای هێناوە سەخاوی باشیان دروست کردووە لەگەڵ بازاڕێکی گەورە، بە هەڵەبجەی جوان کردووە.

لە ڕۆژهەڵاتدا ئێرە تەنها جێگەیەکە کەوا ژنێك بەم جۆرە حوکمی تیا بکات[٣]!.



E.B.Soane

(٣) ئەمە ناوی کتێبەکەیەتی:

To Mesopotamia and Kurdistan Disguise, London.بۆ ناوەڕۆکی ئەم کتێبە بڕوانە: گ، گەلاوێژ، ژ٤، ٥، ٦، ٧ ،ساڵی ١٩٤٥.



یەکێکی تر لەو گەشتە بەسوودانەی گەڕیدەکانی ئینگلیز بۆ کوردستان، کە وەکو کتێبێك لە بواری ڕۆژهەڵاتناسیدا بایەخی خۆی هەیە، گەشتە نهێنییەکەی (کلۆدیۆس ریچ)ە بۆ کوردستان.

Ci.J. Rich،Narrative of a Residence in Kurdistan، London،1820..

(ریچ) لەو گەشتەیدا زۆر سەرنجی وردی مێژوویی ئەو سەردەمە، بەتایبەتی دەوری بابانەکانی لە کتێبەکەیدا یادداشت کردووە، لەگەڵ چەندین سەرنجی جوگرافی دەربارەی سروشتی کوردستان و ژمارەی دانیشتووانی شارەکان و پەیوەندی هۆزەکان و چەند لایەنێکی ئتنۆگرافی لە کوردستاندا، لە پەرەگرافێکی کتێبەکەیدا سەبارەت بە هەستی نەتەوەیی ئەورەحمان پاشای بەبە نووسیویەتی:

(کاتێك کوچك سلێمانی پاشای بەغدا لە دەروازەی باڵا یاخی بوو، ڕەئیس ئەفەندی کە لە ئەستەمبووڵەوە بۆ لابردنی هاتبوو حکوومەتی بەغدای بۆ ئەورەحمان پاشا پێشنیار کرد.

بەڵام پیری گەورە زۆر ژیرانە ئەو شەرەفەی ڕەتکردەوە و وتی ڕاستە بەو کارە من دەبمە *وەزیرێکی* لە پێش، بەڵام تنۆکێ بەفراوی شاخەکانم هەموو ڕێزی ئیمپراتۆرییەت دێنێت. جگە لەوە بە چوونم بۆ بەغدا سەروەت و سامانی خۆم زۆر دەبێت، بەڵام ئەو کارەم دەبێتە هۆی هەرەس هێنانی یەکجاری بنەماڵەی بەبە)[٤].

(مستەر فرازەر)یش وەکو گەڕیدەیەکی ئینگلیز، دوای ئەوەی چەند گەشتێکی بۆ کوردستان کردووە، سەبارەت بە پەیوەندی کۆمەڵایەتی لەو کۆمەڵگای کوردەواری زۆر سەرنج و تێبینی تۆمار کردووە، یەکێ لەو سەرنجانەی ئەوەیە (کە تێکچوونێکی نزیك لە نێوان کوردەکانی ئەمڕۆ "واتە سەرەتای سەدەی نۆزدەم"و کلان-ی سکوتلەندییەکان High Landers چەند سەدەیەك پێش ئەمڕۆ هەیە...

(٤) کتێبەکەی کلۆدیۆس ریچ تەرجەمەی سەر زمانی کوردییش کراوە ، بڕوانە: گەشتی ریچ بۆ کوردستان، وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە حەمەی حەمە باقی، تەوریز، ١٩٩٢. هەروەها کورتەی Baghdad in Bygon Days بەغدای ڕۆژانی ڕابردوو)ی ریچ لە گۆڤاری گەلاوێژ ژمارە(٥، ٦، ٧، ٨، ١٠) ، ١٩٤٦ لەلایەن قادر خەفاف تەرجەمە کراوە.

ئەمەش بە گەلێك نیشانە هەستی پێدەکرێ وەك بوونی: شەرەفێکی بەهێز، قسە گەیاندنە سەر، بەگزادەیی، رێزگرتنی خزم و کەس.

کوردەکانی باشوور و ناوەڕاست هەڵوێستی مرۆڤایەتییان بەرامبەر بەژن زیاترە وەك لە موسڵمانەکانی دیکە، هەستێکی ئەدەبی زیندووو خۆشویستی بۆ شیعر.".

فریدریك میللینگن Major Fredrick Millingen کە ئەفسەرێکی ئینگلیز بووە لە ساڵی ١٨٦٩دا گەشتێکی بۆ کوردستاندا کردووە و گەشتنامەکەی بە ناوی (*ژیانی سەرەتایی لە ناو کوردەکان.* The Wild Life among Kurds *بڵاوکردۆتەوە.*

سەبارەت بە باری گوزەران و خوڕەوشتی کوردەکانی ئەرزەڕۆم و وان و ئەرجیش و ناوچەکانی دیکەی کوردستانی باکوور زۆر شتی وردی نووسیوەو زۆر سەرسامی سروشتی کوردستان بووە، نووسیویە و دەڵێ:-

**(دووکاندارە دڵ چاکەکانی بازاڕی ئەرزەڕۆم بە دوور و درێژی باسی درێژی و ترسی ئەو رێگەیەیان بۆ دەکردم و جار جار بە ئیحاوە قسەی وایان بۆ فڕێ دەدام لە لایەکی تریشەوە زۆر کەس باسی خۆشی وان و دەوروپشتەکەیان دەکرد منتوجات و جوانی باغ و بێستانەکانی دەیان شوبهاند بە ئەرزی موقەدەس)**[5].

هەروەها لە بڕگەیەکی دیکەدا، سەبارەت بە گوندێکی کوردستانی باکوور بە ناوی(نوشە) نووسیویەتی:

**"ئێوارێ گەیشتینە دێی (نوشە)و لە ماڵی شێخ لاماندا کە مێوانداریییەکی چاکی کردین و چێشتێکی نایابی بۆ لێناین و شەو بە رەحەتی نووستین، ئەم گوندە دەوڵەمەند بوو، ئەهالییەکەی هەموو خەریکی کشتوکاڵ و مەڕومالاَت بەخێو کردن بوون.**

**لە گوندی (نوشە) تەسادوفی جەڕەی کۆن کۆن و مەخزەنی گەورە گەورەم کرد کە لە بەرد دروست کرابوو لە ئەرز قایم کرابوو، دەغڵ، شەراب، سرکە یان دۆشاویان تیا محافەزە ئەکرد.**

(٥) ناجی عباس، گەشتێ لە کوردستان هەشتا ساڵ لەمەوبەر، گ، گەلاوێژ، ژ ٥، س٦، مایسی ١٩٤٥، ل ٦٧.



**ئەو دەمە دیسانەوە قسەکانی ئەکسۆنۆفۆنم هاتەوە بیر کە ئەڵێ کاردوکەکان لە ناو مەخزەنی بەرددا شەرابی خۆشیان هەبوو.**

**ئەڵێ زۆر شتی ئەم ناوە ٢٣ قەڕن لەمەو پێش ئەکسۆنۆفۆن چۆن دیویە هەروا ماوەتەوە و لەو دەمەوە کەس وەسفی ئەم وڵاتەی نەکردووە. بێجگە لە (کاپتەن وێلبراهام Captain Wilbraham) لە شرکەتی هیندی شەرقی کە لە ساڵی ١٨٣٣ لە ئەرمەنستان سیاحەتێکی کردووە.**

**بەڕاستی ئەکسۆنۆفۆن لەگەڵ ئەوەشدا کە سەردارێکی لەشکر بووە و خەریکی شەر و شۆڕ و تێپەڕبوون بووە، لە مولاحەزە و ورد بوونەوە دوانەکەوتووە و باسی زۆر رەوشت و خوی ئەهالی ئەم مەنتیقەیەی کردووە، کە لە ناو خانووەکانی (نوشە) ئەگەڕام هەستی ئەوەم ئەکرد کە ئەکسۆنۆفۆنیش وەك من لە وەختی خۆی گەڕاوە و شتی دیوە و تەدقیقاتی خۆی تۆمار کردووە و زۆر شتی ئەو دەورە لە ئەوزاعی ئیجتیماعی کورد و ئەرمەنییەکان هێشتا ماوە و بۆنی ٢٣٠٠ ساڵ لەمەو پێشی لێوە دێ**[6]".

(د. برانت Dr. Brant) کونسوڵی ئینگلیز لە دیاربەکر، لە گەشتەکەی خۆی لە ساڵی ١٨٣٨دا بۆ کوردستان، کە دوایی بە ناوی (گەشتێك بە کوردستاندا) لە سەرەتای هاوینی ١٨٣٨دا سەبارەت بە نائارامی ناوچەی وان لەو سەردەمەدا نووسیویەتی: "فەرمانڕەوایی خراپ و نەبوونی ئاسایش و ئەمین نەبوون لە ژیان یەکەم هۆن بۆ پەرەسەندنی باری ئابووری ناوچە بە پیتەکەی وان".

مایۆری ئینگلیزی (راولینسۆن H. C. Rawlinson)، لە وتارێکیدا لە گۆڤاری کۆمەڵەی جوگرافی شاهانەی لەندەن، لە ژێر سەردێڕی "*گەشتێك لە تەورێزەوە*" بڵاوی کردۆتەوە و خۆیشی لە لەشکری شاهەنشایی ئێراندا لە ساڵی ١٨٣٩دا سەرکردەیەکی سوپایی بوو، نووسیویەتی:

"کوردە موکرییەکانی ناوچەی(سولدز) کە کەوتنە ژێر دەسەڵاتی تورك و ئێرانەوە زۆر لەو سەربەخۆییەیان دۆڕاند کە هەیانبوو، وە وایان لێهات کە لە جووتیارە تورك و ئێرانییەکان جیانە ئەکرانەوە".

(٦) ناجی عباس، گەشتێ لە کوردستان هەشتا ساڵ لەمەوبەر، گ، گەلاوێژ، ژ ٩، س٦، ئەیلوولی ١٩٤٥، ل٢٩.

ئاركیۆلۆژی بەناوبانگی ئینگلیز(لی یارد) لە ساڵانی ١٨٤٥-١٨٥١ لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا خەریکی پشکنینی ژێر زەوی بووە. گەشتێکی بە ناوچەکەدا کردووە و بۆ ئینگلتەرەی پێشنیار کردووە، کە بە وریایی لەو کانانە بگەڕێن کە دەتوانرێت بەکارهێنرێن بۆ بازرگانی وەك ئەو شتانەی کوردەکان لە رەنگکردندا بە کاریان دەهێنا.

هەروەها" داوای کرد، کە زۆر بە چالاکی خەریکی دانانی فەرهەنگی شێوەکانی کوردی و زمانی گەلەکانی تری کوردستان بن".

(هینری تروتیر) کونسولی ئینگلیز لە شاری وان، لە کودەتای سەدەی نۆزدەهەمدا چەند وتارێکی لە بڵاوکراوەی کۆمەڵەی جوگرافی ئیمپراتۆرییەتی رووسیا- بەشی قەفقاس سەبارەت بە بارودۆخی ئەو کاتەی کوردەکان بڵاوکردۆتەوە دەڵێ: " هەڤدە پێشەوای کورد کە سەرۆکی چل هەزار کەسی(وان)و دەرویشتی بوون مەزبەتەکیان دا بە نوێنەری سوڵتانی عوسمانی کە نێردرا بوو بۆ رێخستنی کاروباری ئەو ناوە لەم مەزبەتەیەدا داوای کردنەوەی قوتابخانەیان کرد وەبە ناوی هەموو دانیشتوانەوە ئامادەیی خۆیان پیشاندا کە خەرجی ئەم قوتابخانانە لەسەر خۆیان بێت".

(کورزون) لە کتێبەکەیدا بە ناوی (ئێران وە مەسەلەی فارسی) لە ساڵی ١٩٠٦دا بڵاوی کردۆتەوە و خۆیشی نوێنەری پاشای ئینگلیز بوو لە هیندستان نووسیویەتی: (مێژووی کورد لێڵە، کورد گەلێکی بێ وێژە و بێ مێژووە).

کورد بە رێك و پێکی بۆی ئەگەر بکەوتایە ژێر دەستێکی بە هێزە و بە ساداوە). هەروەها دەڵێ:- کورد هەتا بڵێی "بێئسوولە" و گەلێکی گێلە، نازانێت پەڕاو، قوتابخانە و زانیاری چییە...).

دیارە وەڵامی گەڕیدەیەکی وا، هەر لە پێش خۆی بیروڕای هێنری تروتیر کە پێشتر باسمان کرد وەڵامی ئەو قسانەی کورزون دەداتەوە. لە ساڵی ١٩١٩دا رۆژهەڵاتناسی ئینگلیزی (ل.و.فوسوم L.O.Fossum، کە مسیۆنێرێکی ئەمەریکییە، کتێبێکی لە بابەت دیالێکتی کوردی موکری و بەتایبەتی لەسەر مۆرفۆلۆژی ئەو بن زارە داناوە. لە بارەی کتێبەکەی (فۆسۆم) لە (دیاری ژ. ك بۆ لاوەکانی کورد — ١٩٤٣)دا هاتووە:



مستەر فاسۆ مسیۆنی لۆتریانی ئەمەریکی لە ساڵی ١٩١٦دا لە سابلاخ کتێبێکی دەستووری زمانی *کوردی* (Apractical Kurdish Grammar) ی داناوە، بەڕاستی گەنجینەیەکی هێژاو بەنرخە وادەردەکەوێ یەکەم پیاوێکی لە کوردستانی موکریانا بە کوردی نووسیبێتی، ئەم زاتە شەریفەیە. مستەر فاسۆم کتێبەکەی لە ساڵی ١٩١٩دا لە ئەمەریکا چاپ کردووە کە لە سابلاخەوە بۆ ئێمەیان ناردووە لە سەرەتا بەم جۆرە خۆی دەناسێنێت.

فاسۆم. ف.د مسیۆنی ئەمەریکی دانەری کتێبێکی گۆرانیو لە چاپ دەری رۆژنامەیێکی مانگانە بە زمانی کوردی، وا زەن دەکرێت ئەم رۆژنامەیەی لە سابلاخەوە نووسیوە بۆ لە چاپ دان ناردوویەتیە ئەمەریکا، بەڵام نە ئەم رۆژنامەیەو نە کتێبی گۆرانییەکەی وەدەست ئێمە نەکەوتووە. نەتەوەی کورد خزمەتی ئەم پیاوە گەورەی هەرگیز لە بیر ناچێت، داخەکەم وێنەی مستەر (فاسۆم)مان وەگیر نەکەوت دەنا لێرەدا چاپمان دەکرد. مستەر فاسۆم لە لاپەڕەکانی دوایی دەستوورەکەیا چەند گۆرانییێکی بە کوردی نووسیوە[٧].

لە ساڵی ١٩٢٢دا (ر.ف. گاردین) کتێبێکی لەسەر رێزمانی کرمانجی شێوەزاری بادینی و کوردەکانی موسڵ داناوە و کتێبەکەی لە ساڵی ١٩٢٢ لە بەغدا چاپکراوە[٨].

لە بارەی ئەم کتێبەی ر. ف. گاردین دکتۆر ئەورەحمانی حاجی مارف دەڵێ:

جاردین هەرچەندە لە هەموو لایەکی باسەکەی نەکۆڵیوەتەوە و زۆر شتی هەر بە کورتی بڕیوەتەوە، بەڵام کتێبەکەی بە یەکێك لەو کارە هەرە سەرکەوتووانە دادەنرێت کە لە بارەی رێزمانی کوردییەوە دانرابێت و کەرەستەکەی زاری کرمانجی ناوچەی موسڵ بێت.

جاردین بە شێوەیەکی زانستانە و ورد بۆ گەلێك لە کێشە گەورەکانی رێزمانی کوردی چووە، بەڵام بەداخەوە لە هەندێکی تریاندا بە هەڵە چووە.[٩]

---

(٧): ناوی کتێبەکە بەم شێوەییە:
Fossum, A practical Kurdish grammar, Minneapolis, 1919.

(٨) : ناوی کتێبەکەی بەم شێوەیە:
F.Jardin, Bahdinan Kurmanji, Baghdad, 1922.

یەکێ لەو رۆژهەڵاتناسە بەناوبانگانەی ئینگلیز کە شوێنێکی دیاری لە کوردناسیدا هەیە ئەویش (ئەدمۆندس- C. J.Edmonds)ە، ئەدمۆندس ماوەیەکی زۆر لە کوردستاندا مایەوە و ئەگەرچی وەکو سەرکردە سوپایی و کاپیتان و مسیۆنێرەکان هەرچییەکیان کردبێ لە پێناو زیاتر چەسپاندنی دەسەڵاتی ئینگلیز لە کوردستاندا، بەڵام وتار و کتێبە بەنرخەکانی ئەدمۆندس لە بارەی مێژوو و جوگرافیای کوردستان شایەنی لێکۆڵینەوەن و سەرچاوەیەکی بە پێزن بۆ توێژەرەوەی کورد. لە کتێبە دیارەکانی ئەدمۆندس، کتێبێکی (کورد و تورك و عەرەب Kurds, Turks And Arabs، ئەدمۆندس لەم کتێبەدا، دەربارەی مێژوو و جوگرافیا و زمان و ئەتنۆگرافیای کوردی نووسیووە، یەکێ لەو رەخنانەی لەم کتێبەدا دەگیرێ ئەوەیە،( ئەو هەرێمە کوردە گەورەیەی لە کوردستان نەژماردووە، کە دەکەوێتە نیوەرۆی خەتی مەندەلی- کرماشانەوە، کە بە (لورستان)(پشتکۆ) بەناوبانگە.

هەروەها (لە لایەکی تریشەوە"سنجار"ی لە خەریتەکەی دەرهێناوە، کە لە لایەکی بچووکی کوردستانە...)[١٠].

لە ساڵی ١٩٤٤ لە لایەن(م. لۆرانس راین)ەوە وتارێکی سەبارەت بە مێژووی گۆڤار و رۆژنامەی کوردییەوە لە گۆڤاری Royal CentralAsian بڵاوکردۆتەوە.

نووسەرەکەی پانۆرامایەکی رۆژنامە و گۆڤارە کوردییەکانی کردووە، لە رۆژنامەی (کوردستان) لە ساڵی ١٨٩٨ تاوەکو گۆڤاری گەلاوێژ لە ساڵی ١٩٣٩دا. سەرەتا ئاماژە بە وتارێکی ئەدمۆندس دەکات کە لە بارەی زمانی کوردی شێوەی کرمانجی خواروو نووسیویەتی و پاشان لە (رۆژا نو)ی دکتۆر کامەران عالی بەدرخان دەدوێ. جێگەی سەرنجە زۆربەی ساڵەکانی دەرچوونی رۆژنامە و گۆڤارەکانی بە هەڵە نووسیوە بۆ نموونە ساڵی دەرچوونی رۆژنامەی (کوردستان)ی دایکی بە ١٨٩٧ نووسیوە، کە خۆی

(٩) د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، چی لە بارەی زمانی کوردییەوە نووسراوە، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٤، ل ٦١.

(١٠): ئەم کتێبەی ئەدمۆندس تەرجەمی سەر زمانی عەرەبیش کراوە بڕوانە: کورد و ترك و عرب ، ترجمة جرجیس فتح الله، ط٢،دار آراس للطباعة والنشر ، اربیل، ١٩٩٩.



(١٨٩٨)ە، رۆژنامەی (پێشکەوتن) بە (١٩٢٠-١٩٣٠) نووسیوە، کە خۆی (١٩٢٠-١٩٢٢)ە.[١١]

دەبلیو .جی. ئیلفنستن لە ساڵی ١٩٤٦ زنجیرە وتارێکی لەسەر کورد و کوردستان بەتایبەتی لە گۆڤاری ئینتەرناشناڵ ئەفێرز Internation Affairs دا بڵاوکردۆتەوە.

نووسەر نووسیویەتی:

(هەرچەندە کە سەرۆکی عەشیرەتەکان ترسیان لەبڵاوبوونەوەی شیوعییەت هەیە لەناو عەشیرەتەکەیانا و بڵاوبوونەوەی شتی واش کزبوونی دام و دەزگای ئەوانە، بەڵام مادام تورکەکان هەر لەسەر ئەو لاسارییە ئەڕۆن کە ئەڵێن کورد لە ناو ئێمەدا نییە و دەیانەوێ کوردەکان بکەن بە تورك، سەرۆکی عەشیرەتەکان ئەوەیان هەر پێ خۆشترە کە لەو خەتەرییە رزگاریان ببێ یا بکەونە بەردەستی کۆماری سۆڤیەتی، وەیا دام و دەزگای خۆیشیان کەمتر ببێتەوە.

لە کۆتایی وتارەکەیدا دەڵێت:

(تەئریخ دەریخستووە هەرچی هەرایەکی کورد هەبووە لەوەوە روویداوە، چونکە ویستوویانە قەومەکەیان کە چەند بە تەقالید و گەلایەتی خۆیانەوە نووساون لەمە مەحروم نەکرێن لە لایەکی تریشەوە گومانی تێیدا هەیە سەربەخۆییەکی تەواو ئەگەر بە کورد درا هەموو شتێك بە تەواوی حەل بکا. چاکترین سیاسەت ئەوەیە بە بێ جیاوازی کوردی تورکیا و عێراق و ئێران و سوریا بە ئەندامی دەوڵەت بناسرێن لەگەڵ ئەمەشدا تەقالیدی میللییان دەبێ بە دڵسۆزانە حورمەتی بگیرێ، چونکە دەرسێکی قەتعی کە لە تەئریخی کوردەوە وەرگیرابێ، ئەوەیە کە تەمسیل کردنی کورد هیچ گومانی تێیدا نییە بێ سوود دەمێنێتەوە و سەرناگرێ و کورد ناکرێت بە میللەتێکی تر.[١٢]

لە ساڵی ١٩٦٦دا ئێرنست مەکارۆس لە نیۆیۆرك کتێبێکی لە بارەی رێزمانی کوردی بڵاوکردۆتەوە. لە رووی مێژووییەوە سەرچاوەیەکی گرنگە.[١٣]

(١١) : لەبارەی ئەم وتارەوە بڕوانە: گ، گەلاوێژ، ژ ٤، س٦، نیسانی ١٩٤٥، ل٢١-٢٥.

(١٢) بڕوانە: گ، گەلاوێژ ژ ١١، س ٧، تشرینی دووەمی ١٩٤٦، ل٢٥.

(١٣) ناونیشانی کتێبەکەی وایە:

(د. ن. مەکەنزی D.N. Mackanzie) وەك کوردناسێك لە ناو کوردناسە ئینگلیزەکاندا پایەیەکی بەرزی هەیە و سەردانی کوردستانی کردووە تارادەیەك فێری زمانی کوردی بووە و بیروڕای تایبەتی خۆی هەیە.

لـە هــەمووی گــرنگتر کــوردی خــۆش دەوێ و بــە حــەز و ئارەزوویــەکی زۆرەوە هەقایەتی فۆلکلۆری کوردی ناوچە جیاجیاکانیشی لە فـەوتان بـۆ پاراسـتووین و لـە بەرگی دووەمی کتێبەکەیدا کە بە ناوی Kurdish Dialect Studies (لێکۆڵینەوە لە دیالیکتەکانی کوردی)یە ژمارەیەکی زۆر هەقایەتی ناوچە جیاجیاکانی بـۆ تۆمـار کـردووین کـە هەنـدێکیان زۆر بـاون و ڕەگ و ریـشەیەکی ئایینییـان هەیـە وەکـو هەقایەتی (یوسف و زولەیخا). بێگومان هەر ئەو کەرەستەیە خۆیـشی و خـەڵکیتریش وەکو کەرەستەیەکی زمانەوانی سوودیان لێبینیووە. لە بەرگی یەکـەمی کتێبەکەیـدا کە سەبارەت بە ئاستەکانی زمانی کوردییە و لە ئاستی فۆنۆلۆژیدا باسی گۆڕانێکی فۆنۆلۆژی شێوەی دەشتی هەولێر دەکات کـە چـۆن دەنگـی (ح)و(ع) تێکـەڵ دەبـن و جێگۆڕکێ دەکەن وەکو: حاجی عەلی/ عاجی حەلی[١٤]

مستەر هابارد، کە یەکێ بووە لە ئەندامانی لێژنەی راکێشانی هێڵـی سـنووری نێوان ئێران و تورکیـا لـە سـاڵی ١٩١٣-١٩١٤دا کتێبێکـی بـە ناونیـشانی (لـە کەنداوەوە تا ئارارات) نووسیوە و رۆژانە یادداشتی خۆی لە گوند و شارۆچـکەکانی کوردستان نووسیوە و چەندین یادگاری خۆشی لەگەڵ کـورد و خـواردن و سروشـتی کوردستاندا تۆمار کردووە، ئێمـە لێـرەدا یادداشـتی رۆژی ١ی حـوزەیرانی سـاڵی ١٩١٣ی دەنووسینەوە:

**( ئەم بەیانیە لیژنە دەرچوو بۆ داچەقاندنی کۆڵەگەیەك لە شیوی (تەویڵە)دا کـە دوو میل لە دێکەوە دوورە، دێهاتییەکان پەرژینێکیان لە داری تو بۆ ئەم شیوە کردووە و بـۆ ئاودانی ئەو زەوییانە کە ٤٠٠-٥٠٠ پێ لـە ژوور شـیوەکەوەیە جۆگایـان راکێـشاوە و کردوویانە بە باخچەیێکی دڵگیر. خۆ ئێجگار ئەو ئاوە روونەی ئەڵێی بلوورە زیاتر خۆشی کردووە. سەعات هەشت گەیشتینە تەوێلە بەلای تەکیـەی دەروێـشە نەخـشبەندییەکانا**

(١٤) ناونیشانی کتێبەکەی مەکەنزی بەم شێوەیەیە:
D.N. Mackanzie, Kurdish Dialect Studies London, 1961.



**رابوردین کە دانیشتبوون چایان ئەخواردەوە و تفەنگەکانیشیان بە شانەوە بوو، منیش لە پێش ئەوەدا سەرکەوم بۆ بەرزییەکان چووم لایان دانیشتم و دوو پیاڵە چام خواردەوە، ئەو دیوەخانە ژوورێکی چوار گۆشە بوو لە ناوەوە بۆ دانیشتن سەکۆی لێ دروستکرابوو و لـە سووچێکەوە ئاگردانێك بۆ سەماوەر هەڵکەنرابوو، چەند پیاڵە و کەوچکێك و لەگـەنێکی دەست شتن دانرابوو، لـە دوای خواردنـەوەی دووپیاڵـە چـا لەگـەڵ ئـەم بـرادەرە ژیـرو رووخۆشانە کەوتمە رێ تاگەیشتمە سەر لوتکەی شـاخەکە کـە ئـەیڕوانی بەسـەر دۆڵـی سیروانی دڵگیرا، لەو رووەوە دێیەکم بەدی کرد نیـازم بـوو بـۆی بـچم، بـەڵام چاوسـاخە کوردەکەم نەیهێشت، وابزانم لەبەر دوژمنایـەتی ناوخۆیـان بـوو. ئائێـستا کەوتووینـە ناوەڕاستی کوردستان، بۆ یەکەم جار وێنەی کورد لە مێشکما جێگیر بوو، ئـەم وێنەیـە ئینسانێك پیشان ئەدا سەر و چـاو جـوان، بـاڵا رێـك، پـانتۆڵێکی پـڕ چـرچ و لـۆچ و چۆخەیێکی لە بەردایە کە زۆر لە چاکەتی هەڵپەڕینی ئیسپانییەکان ئەکا، سەرپێـچێکی رەنگاوڕەنگ و پشتێنێك ئەبەستێ کە هەموو جۆرە چـەکێکی ئـەکا بـە بـەرا، لەسـەر ئەمانەشەوە کورتەکێکی لبادی ئەستوور (پەستەك) لە بەر ئەکا بۆ ئەوەی لە زستانەکانی کرێوە و با پارێزگاری لەشی بکا.**

**ژنیان هەتا کچە ئێجگار جوانە، بەڵام زۆری پێ ناچێ لەبەر خەریکی ئیشی ناو ماڵ و مناڵ بە خێوکردن و لەبەر کردنی ئەو جلانەی کە هەر بۆ پیرێژن دەست ئەدا و کورت نەکردنەوەی خۆیان وەکو کچەکانی ئەمانە ئەبێتە هۆی سیس بوونی جوانییەکان، یەکێ لە خشڵی ژنان لوتەوانەی پیرۆزەیە، سەروپێچی ژنان کلاوێکی ئاوریشمە دەورەکانی مورووی سوور و شین و پارچە پارەی زێڕو زیوی پیا ئەدروون و بۆ هەڵسووڕانی ژنەکە دەسەسرێ ئاوریشم (مشکی- سرکەیی)ی لەسەر ئەبەستێ بە پێی باوەڕی من ژیان لە ناو ئەم گەڵەدا کە ژنیان وەکو بەندەی کڕاو هەست ناکەن ژیانێکی بە تامە، لەم ناوانەدا ژنان کاتی خۆیان بە گەشتی ناوباخ و دایکەکان بە تەشی رستن و کچەکان بە یاری رائەبوێرن.[١٥]**

(١٥) رەشید محی الدین، لەخلیجەوە تا ئارارات، گ، گەلاوێژ، ژ ٥، س٧،مایسی ١٩٤٦، ل٦-٧.

## سەرەتایەک

تا ئێستا مێژوونووسە کوردەکان و بیانییەکان زۆر کەم لایان لە لوڕستان کردۆتەوە، گوتاری سەربەخۆ و کتێبیان دەربارەی نووسیووە. ئەوەیشی نووسیویانە لە زۆربەی کاتدا لایەنێك بووە وەك مێژوو، یان لایەنی ئەتنۆگرافی و لایەنەکانی دی، گوتارێکی وا بەرچاو ناکەوێت هەموو لایەنەکانی بەخۆوە گرتبێ. چونکێ هەندێ مێژوونووسی ئێرانی و بیانی چ لە کۆن و چ لە تازەدا لوڕەکانیان لە کورد جیاکردۆتەوە. جا لەبەر هەر نیازێك بوویێت، ئەم باسە بە گشتی دەربارەی لوڕستانە مێژوو و جوگرافیا و فۆلکلۆر و رێزمان و ئایین و.. دەگرێتەوە:

*** ١- دەربارەی وشەی ( لوڕ)**

ناوی زۆربەی شوێن و هۆزەکانی کوردستان، دیار نییە لەچییەوە هاتووە، واتا بنچینەکەی چۆن بووە دوایی چۆن ناوەکە گۆڕاوە. وشەی(لوڕ)یش لەم کۆمەڵە وشانەیە و بیروڕای جۆراوجۆری دەربارە نووسراوە.

( لوڕ) ناوەکەی لە ناوی شارێکەوە، کە لە رۆژهەڵاتی دێزفۆل بووە، **یاقوت الحموی** نووسیویەتی: (لوڕ) عێلێکی کوردن، کە لە کێوەکانی نێوان خوزستان و ئیسفەهاندا نیشتەجێن.

(زبدە التواریخ) نووسیویەتی: (لوڕ) بۆیە پێیان دەڵێن (لوڕ) لە ویلایەنی مانرۆد گوندێك هەیە بە ناوی(کورد) لەو سەرە.



دەربەندێك هەیە پێی دەڵێن لوڕ، چونکێ نەژادی ئەو کۆمەڵەش لە وێوە هاتووە، کە (لوڕان)ی پێدەڵێن[١٦].

بۆ یەکەم جار ناوی لوڕ لە کتێبەکانی (اسطخری و مسعودی)دا بەرچاو دەکەوێت، مسعودی (اللریە)ی بە بەشێك لە کوردەکان داناوە و (اسطخری)یش دەربارەی (بلاد اللر) دواوە، کە یەکەم خێڵ لەم شارە، یان لە شارەکانی نێزیك وێندەرێ بوونە بە (لریە) ناسراون.

پاشان ئەو ناوە بەو خێڵانەی دیکەش گوتراوە کە بەرەو کێوەکان کۆچیان کردووە و لەوێ ماونەتەوە و بەم سەرزەمینەش گوتراوە (لوڕستان) یان سەرزەمینی لوڕەکان.

(یاقوت الحموی)یش لە سەدەی حەوتەمی کۆچیدا بە هۆزێکی کورد، کە لە کێوەکانی نێوان خوزستان و ئیسفەهاندا ژیاون گوتووە (لوڕ) و ئەو شوێنەشی کە تێیدا ژیانیان بەسەر بردووە بە (بلاد اللر)، یان (لوڕستان)ی ناوبردووە[١٧].

هەروەها نووسەری کتێبی(گزیدە) لەو باوەڕەدایە، کە لوڕ لە زمانی کوردیدا واتای (لێڕ) دارستانێکی چڕ دەبەخشێت[١٨].

بەهەر حاڵ بیروڕای یەکەم لە لای من پەسەندە و شەرەفنامەش وای نووسیووە[١٩].

*** ٢- دەربارەی جوگرافیای لوڕستان:**

مەبەست لە لوڕستان بەشی باشووری کوردستانی ئێرانە کە درێژ بۆتەوە لە رێگای قەسری شیرین- کرماشان لە باکوورەوە تا بەندەری دیلم و حصار لە باشووردا،

---

(١٦) صدیق صفی زادە، فرهنگ ماد، جلد اول،ص٢٨.

(١٧) علی سیدو الگورانی، اللر ولرستان ، ١٠٩.

(١٨) شەرەفخانی بەدلیسی، شەرەفنامە، وەرگێڕانی: هەژار، ل٨١.

(١٩) فوئاد حەمە خورشید، اللغة الكردية التوزيع الجغرافي للهجاتها، بغداد، ١٩٨٣ ،ص٢١.

ناوچەکانی پێش کۆ و پشتی کۆ و بالاگرێوە و بەختیاری و کوهگەلو و ماسانی دەگرێتەوە[٢٠]. سنووری لوڕستانی بەم شێوەیە دەستنیشان کردووە:

هەرێمی جوگرافیای لوڕستان درێژ دەبێتەوە تا نەهاوەند لە باکوورەوە، بەڵام لە باکووری خۆرهەڵاتەوە تا رووباری (سزار) و (ئاب دو رود)وە (مخمل کوهـ). هەروەها لە باشووری خۆرهەڵاتەوە تا (سەیمەرە و کبیرکوە) درێژ دەبێتەوە[٢١].

لوڕستان ناوچەکەی شاخاوییە، لەگەڵ ئەوەش باخ و باخات و شینایی تێیدا زۆرە و هەروا دارستانی چڕیشی زۆرە و ئاو و هەواکەیش لە هاویندا گەرمە و لە زستاندا ساردە. بەڵام بە هۆی ئەوەی حکوومەتی ئێران ئەم ناوچەیەی فەرامۆش کردبوو تا ساڵەکانی ١٩٣٠ ئەوجا جادەی قیرتاوی بۆ چوو تەنانەت رەزا شا کاتی خۆی لە گەشتێکی بۆ لوڕستاندا، کە لە یادداشتەکانی خۆیدا نووسیویەتی دەڵێ: ئەم ناوچەیە ئەوەندە شارەزام و ئەوەندە لەسەر گەورە شاخەکانی پاسەوانییەتیم کردووە دەزانم کامە بەرد ئێستا دووپشکی زۆری لە بنە[٢٢].

بۆیە ئەم بارە ناهەموارە ببووە هۆی ئەوەی ئەم ناوچەیە لە ڕووی رۆشنبیری و ئاوەدانییەوە پێشکەوتوو نەبێ و دانیشتوانەکەی زێتر لەسەر جووتیاری و ژیانی کۆچەریدا بمێننەوە.

لە رووی ژمارەی دانیشتوانیشەوە ئەوا سەرژمێرێکی ئەوتۆ نەکراوە، کە بە تەواوی و بە وردی و بەڕاستی ژمارەیێك دەستنیشان بکات، تەنها ئەوەنەبێ چەند سەرچاوەیێکی جیاواز بە گوێرەی ئەقڵ سەرژمێرییان کردووە.

---

(٢٠) مسعود عزالدین ساڵەیی، لوڕ و بەختیارییەکان، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە، ١٠٦، ١٩٨٥، ل٢٥.

(٢١) رضا شاهـ کبیر، خاطرات رضا شاهـ. کبیر، ص٤٨.

(٢٢) زبیر بلال اسماعیل، مێژووی زمانی کوردی،ل١٠٨.

لەدەقە عەرەبییەکەدا، ل٦٥.



بۆ وێنە: (زبیر بلال اسماعیل)وای داناوە، ژمارەی لوڕەکان(٦٥٠٠٠٠)هەزار کەس و بەختیارییەکان(٤٠٠ر٠٠٠)هەزارە[٢٣].

سەرباری ئەوەی هەندێ نووسەر لە سەرژمێری کورددا، لوڕەکانیان هەڵاوێردووە و سەرژمێری تایبەتیان بۆ لوڕەکان کردووە[٢٤].

دەربارەی سەرژمێری لوڕەکان مێژوونووس محمد امین زکی لە کتێبی (کوردو کوردستان)دا نووسیویەتی:

(مقداری لوڕی گەورە و بچووك یعنی خلقی (پشت کوهـ) و (پیشکوهـ) لە طرف مستشرقین (کورزون)ەوە لە ساڵی ١٩١٨دا بە ٤٢١٠٠٠ تەخمین کراوە، لەم مقدارە ١٧٠ر٠٠٠ی بەختیارییە و ٤١ر٠٠٠ی (کوهگەلوی) و ٢١٠ر٠٠٠ی لوڕی بچووك یعنی فیلییە، لە ساڵی ١٩٠٤دا مستشرق (رابینۆ) عددی (فیلی) تەحقیق کردووە و لە (پیش کوهـ)دا (٣١ر٦٥٠) ماڵ (تقریبا ١٣٠ر٠٠٠نفووس)[٢٥] و لە (پشت کوه)دا ١٠ر٠٠٠ ماڵ (تقریبا ٥٠ر٠٠٠ کسی)ی تەقدیر کردووە[٢٦].

هەروەها لوڕستان چەند رووبارێکی تێیدایە، گرنگترینیان: رووباری (سیمارە) و (گارون) و (دز) و (کولادستان) و (ئابی شیرین)ە. هەروەها ئەمەش ناوی زنجیرەیەك لە چیاکانی لوڕستان:

١- کاوە مهلە، کیالان، ریدکۆه

٢- منار، کێو، سفیدکۆ

---

(٢٣) الدکتور شاکر خصباك، الاکراد، ص٥١٩.

(٢٤) محمد امین زکی، کورد و کوردستان، ل١٩.

(٢٥) فوئاد حەمە خورشید، لرستان الاقلیم الجنوبي من کردستان ایران، مجلة شمس کردستان، ع٦٦،لسنة ١٩٨٤،ص١٠.

(٢٦) جمال ودیعي، قبائل و عشائر اللور، ترجمة: جلال وردة، مجلة الثقافة، العدد١٢،١١، لسنة ١٩٨٠، ص١٢٤-١٢٥.

٣-بادمستان، زەردە، بایار، کوتەلی دوتر[٢٧].

سەرژمێری نزیك لە راستی بۆ لوڕەکان لەو باوەڕەدام ئەو ژمارەیەی جمال ودیعی دەستنیشانی کردووە چاکترین سەرژمێری تازەیانە، نووسەر دەڵێ: لە ساڵی ١٩٦٧دا دانیشتوانی لوڕستان گەیشتە ٦٨٨ر١٣٩ کەس و ٣٨٦ر٢٢٢ کەسیان لە پارێزگای (خورەم ئاباد)ن و ١٧٥ر٨١١ کەسیان لە پارێزگای (بروجەرد)دا نیشتەجێن و ئەوەی دیکەش ١٢٦ر٦٠٦ کەسیان لە (ئەلیگودرز)دان، هەروەها نووسەر هۆزە لوڕەکانی بەم شێوەیە دابەش کردووە:

١- بیراندۆ لە خرم ئاباد رەحیمخانی(لە دێزفول).

عالیخانی (لە بروجەرد و خورەم ئاباد)

٢- سگوەند لە ئالستان.

٣- چنگی، پابی، جودگین، دیرکوند[٢٨].

### * ٣- دەربارەی سەرچاوەی نژادی لوڕەکان:

زۆربەی سەرچاوە مێژووییەکان لەوەدا یەك دەگرنەوە، کە کاسییەکان یا کاسووەکان یان کاشییەکان سەرچاوەی نەژادی لوڕەکان بوونە و لە کێوەکانی زاگرۆس و لە لوڕستانی ئێستا ژیانیان بە سەر بردووە و پەیوەندییەکی بە تینیان لەگەڵ هۆزە هاونژادەکانی هاوسێیاندا بووە و زۆرجار لە میللەتە بەهێزەکانی ئەو سەردەمەیان داوە و دەستیان لێوەشاندوون.

لەم رووەوە ئی. م. دیاکۆنۆڤ نووسیویەتی:

(٢٧) ئی. م. دیاکۆنۆڤ، میدیا،ل ١٨٦.

(٢٨) قەناتی کوردۆ، هەندێ بیروباوەڕی هەڵە لەبارەی زمان و مێژووی کوردەوە، ل٤٠.

- هەروەها بڕوانە: علی سیدو الگورانی، اللر و لرستان، ص١٠٩.

- بڕوانە: الدکتور عبدالرحمن قاسملو، کردستان و الاکراد، ص٢٥٦.

- بڕوانە: احسان نوری پاشا، کرد و کردستان، ص٦.



شوێنی نیشتەجێی (کاسییەکان) بە ئاگادی- کاشی- Kassu لە رۆژگاری کۆنەوە تا ئەوکاتەی ئەسکەندەری ماکدۆنی ئێرانی گرت — کیشوەرە کویستانییەکان بووە. (واتا لە بەشی ژووروی ئەو رووبارانەوە کە دەراوەکانیان لە سەردەمی کۆندا کیشوەری عیلامی لێ پێك هاتبوو)وە ئێستە پێیدەڵێن لوڕستان[٢٩].

دوای ئەوە بەردەوام دەبێ و دەڵێ:

زۆر لەوە دەچێ هۆزەکانی(لوڕ)ی ئێستا کە لە کوێستانەکاندا بە بەخێوکردنی مەڕ و ماڵاتەوە خەریکن و بە ئاژەڵداری دەژین، ئەوانە پاشماوەی ئەوان بن[٣٠].

هەندێکی دی لە مێژوونووسان نەژادی لوڕەکان دەگەڕێننەوە سەر لولوییەکان[٣١].

**محمد** امین زکی مێژوونووس زیاتر لەگەڵ رای یەکەمیان دایە[٣٢].

بە هەرحاڵ ئەوەی لێرەدا گرنگە و دەمانەوێ پشتگیری لێوە بکەین ئەوەیە، کە لوڕەکان (لوڕە ئەسڵییەکان یان رەسەنەکان) کۆچیان نەکردووە بۆ چیاکانی زاگرۆس، بەڵکو نیشتەجێی وێ بوونە و بەر لە کۆچکردنی ئارییەکان بۆ چیاکانی زاگرۆس. هەروا دڵنیاشین لەوەی کە لەو سەردەمەدا لە کاری هونەری و گشت بوارەکانی دی ژیان تاڕادەیەك پێشکەوتوو بوونە، بۆیە دەڵێن لوڕە رەسەنەکان، چونکێ وەك شەرەفنامە دەڵێت:

(٢٩) محمد امین زکی، کورد و کردستان، ل١٠٠.

(٣٠) شرفخان بدلیسی، شەرەفنامە، وەرگێڕانی: هەژار، ل٦٢-٦٣.

- بڕوانە: اللر و لرستان، ص١٥٢.

- بڕوانە: فرهنگ ماد، ص٢٨.

- بڕوانە: اللغة الکردیة، ص٣٦.

- بڕوانە: کرد وکردستان یا تاریخ ریشه نژادی کرد، ص٩٧.

(٣١) احسان نوری پاشا، کرد وکرستان، ص٩٧.

(٣٢) هەمان سەرچاوە، ل٩٧.

لە ساڵی ٥٠٠ هـ /١١٠٦ شاهین، چوار سەد خێزانی کورد لە چیای (السماق) لە ولآتی شام بەرەو لوڕستان هاتن[٣٣].

ئەو بەشەی لوڕە ئەسڵییەکانی لێنیشتەجێ بووە لە دێر زەمانەوە پێی دەگوترێت لوڕستانی بچووك و ئەو بەشەی دانیشتوانەکەی لە شوێنی دیکەوە هاتوون و لەوێ نیشتەجێبوونە پێی دەگوترێت لوڕستانی گەورە و بەختیاری و مامەسانی و کوهگەلو..و چەند هۆزێکی دی. ئێستا پرسیارێکی گرنگ سەر هەڵدەدات، ئەویش ئەوەیە، ئایا لوڕەکان کوردن؟!

بەر لەوەی خۆمان وەڵامی ئەم پرسیارە بدەینەوە حەز دەکەین بیروڕای هەندێ لە نووسەرانی خۆمان و بیانی بەسەر بکەینەوە.

لۆرد کۆرزۆن، لە سەفەرنامەکەیدا نووسیویەتی: ئایا لوڕەکان تورکن یان ئێرانین یان هەر ناوێکی دیکەن؟ گشت مێژوونووسەکان بەم سێ نەژادە قسەیان دەربارە کردوون، بەڵام وا دەردەکەوێ لە تایفەی کوردەکانن، کە لەبەری باکوور نیشتەجێن، بەڵام زمانەکەیان لە زمانی فارسی دەچێت، لەگەڵ ئەوەشەوە جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەل زمانی کوردیدا نییە[٣٤]. هەروەها مستەر ریچ لە گەشتەکەی خۆیدا بەختیارییەکانی بە کورد داناوە و کوردەکانی بە بەختیاری، یان لەك ناوبردووە لە تایفەتی لوڕن!..[٣٥]. لە (قاموس الاعلام الترکی)دا نووسراوە:

گەلی لوڕستان زێتر لە هەموو گەلێك لە کوردەوە نزیکن چ لەڕووی زمان و چ لەڕووی داب و نەریت و لەگەڵ ئەوەشدا لوڕەکان خۆیان بە کورد نازانن لەبەر هەندێ مەسەلەی ئایینی[٣٦].

---

(٣٣) گۆڤاری کاروان، ژمارە ١٩٨٥،٣٥،ل٢٢.

(٣٤) بڕوانە: د. کەمال فوئاد، زاراوەکانی زمانی کوردی و زمانی ئەدەبی و نووسینیان، گۆڤاری زانیاری، ژمارە ٤، بەغدا، ١٩٧١،ل٢٢.

(٣٥) دکتۆر جەمال نەبەز، کورتە مێژوویەکی کوردناسی لەئەڵمانیادا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، ل٤٣٩.

(٣٦) صدیق صفی زادە، فرهنگ ماد،ص٢٩.



بە کورتی، زۆر لە مێژوونووسان لوڕەکانیان بە کورد لە قەڵەم داوەو دیالێکتی لوڕیشیان بە یەکێ لە دیالێکتەکانی زمانی کوردی داناوە و هەندێکیشیان بە هۆی بوونی چەندان وشە زاراوەی هاوبەشی لوڕی و فارسی و نزیکی لوڕستان لە ئێرانەوە، بە هەڵەدا چوون..

خۆ ئەگەر کابرایەکی بیانی لە هەندەرانەوە زۆر شارەزایی لە زمانی کوردیدا نەبێت و لوڕەکان بە کورد نەزانێ رەنگە زۆر جێگای رەخنە نەبێت، وەلێ جێگەی داخە هەندێ نووسەری کوردیش ئەو رایەی ئەوانیان دووپات کردۆتەوە[٣٧].

گومانی تێدا نییە چ لەڕووی زمان و ئەتنۆگرافیا و لایەنەکانی دیيەوە.. لوڕەکان کوردن، یان ئەگەر بە پێی شارەزایانی مێژوو کاسییەکان و گوتییەکان و لولوییەکان بنەچە و نەژادی کورد پێك بهێنن، ئەوا لوڕەکانیش (چ کاسی بن چ لولویی بن) دەبێ کورد بن، هەر بۆ سەلماندنی ئەم راستییە بڕوانە:

(فەرهەنگی لەك و لوڕ)ی حەمیدی ئیزەد پەناهـ، لێدوان و بەراوردکردنی مەحمود زامدار، بەغدا، ١٩٧٨).

لەم فەرهەنگەدا بۆمان دەردەکەوێت:

١- دیالێکتی لوڕی دیالێکتێکی کوردییە و وشە و زاراوەکان و رێزمانەکەی هەروەك دیالێکتەکانی زمانی کوردییە و جیاوازییەکی زۆر کەمی لەگەڵ ئەوانی دیکەدا هەیە، ئەمەش شتێکی زۆر ئاساییە بۆ دوو دیالێکت یان زێتر جیاوازییەکی کەمیان لە وشە و گۆکردندا هەبێت، تەنیا ئەوەندە هەیە کاریگەری زمانی پەهلەوی (واتا فارسی ناوەڕاست) لەسەر زاراوەکانی شێوەی لوڕیی زۆرترە وەك لە شێوەکانی دیکەی کوردیدا[٣٨]. تەنانەت شێخ محەمەد مەردۆخی کوردستانی لە بەرگی یەکەمی کتێبی(تاریخ مردوخ)دا نووسیویەتی:

---

(٣٧) عبدالرحمن محمد امین زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی، بەرگی یەکەم، ل٤٣-٤٤.

(٣٨) بڕوانە: حسین حزنی موکریانی، مێژووی شاهەنشاهانی کوردی زەند، ل٤.

تۆمابوا، مع الاکراد، ترجمة محمد شریف عثمان، ص١٢-١٣.

نزیكترین دیالێكتی كوردی لە پەهلەوی بە پلەی یەكەم دیالێكتی لوڕییە. هەتا لە بنكەی پەهلەوی كۆنیش زۆر نێزیك بووە و تێكەڵاوی بێگانەكان نەبووە و خۆی پاراستووە و هەتا لە ژێر كاریگەری میللەتی ئاشووری و كلدانیشدا نەبوون و دیالێكتەكەی خۆیان نەگۆڕیوە[٣٩].

٢- نووسەر ویستویەتی ئەوە بسەلمێنێ، كە دیالێكتێ نییە لە دیالێكتەكانی زمانی فارسی(واتا لوڕی)، بۆیە لوڕییەكەی نووسیوە و فارسییەكەی نووسیوە، واتا لوڕی- فارسی. هەر لەم رووەوە عبدالرحمن محمد امین زەبیحی لە بەرگی یەكەمی قاموسی زمانی كوردیدا بیروڕای (د. معین)ی وەرگرتووە، كە ئەویش زانایەكە و لەو باوەڕەدایە كە لوڕ فارس نین و لەگەڵ بەختیاریدا خزمن، كە بەختیارییەكانیش بە دڵنیاییەوە كوردن و مامۆستا خۆیشی لەو باوەڕەدایە كە لوڕی گەورە كوردن و بۆ لوڕی بچووكیش پێویستی بە لێكۆڵینەوەی دوور و درێژ هەیە[٤٠].

لە كۆتایی ئەم بەشەدا گەرەكمانە ئەوەش یادداشت بكەین، كە لوڕەكان پیاوی خانەدان و مەزنیان تێیدا هەڵكەوتووە. لەوانە (كەریم خانی زەند) كە سەرۆكی هۆزی لوڕ بوو لە (١٧٥٠- ١٧٧٩) تەختی پاشایەتی ئێرانی گرتە دەست و شیرازی كردە پایتەختی خۆی. فەرمانڕەوایی زەند تا كوشتنی لطف علی خان درێژەی كێشا و دوای ئەوە محمد خان كە یەكێ لە میرە قاجارەكان بوو لە ساڵی ١٧٩٤دا فەرمانڕەوایی گرتە دەست[٤١].

---

الدكتور علاء نورس، العراق في العهد العثماني في العلاقات السياسية، ص٢١٢.

سەرنج: بەڵام ئەم نووسەرە مێژووەكەی بە ١٧٥٧-١٧٧٩ داناوە.

بێگومان ئەمە راستییەكە، حسین حوزنی موكریانیش هەر لەو باوەڕەدایە، ل٢٨.

(٣٩) محمد جمیل بندی الروژبیانی، بندنیجین(مندلی) في التاریخ قدیماً وحدیثاً، ص٣٥٨.

(٤٠) شەرەفخانی بدلیسی، شەرەفنامە، وەرگێڕانی: هەژار،ل٧.

(٤١) شەرەفنامە، ل٢٩.

هەروەها بڕوانە:

گۆڤاری گرشەی كوردستان، كۆزانی فەرهەنگی زمانی كوردی، ژمارە٣، تاران، ١٩٨١، ل١٠٨.



هەروەها وا ناوی هەندێك لە ئەدیب و زانا و ناودارەكانی لوڕەكان یادداشت دەكەین:

ا- ابراهیم بن الفرج البندنیجي:

شاعیر بووە لە سەردەمی الواثق بالله العباسي(٨٤٢م-٨٤٦م) ژیاوە.

ب- عبدالقادر البندنیجي:

یەكێ بووە لە زاناكانی سەدەی حەوتەمی كۆچی[٤٢].

ج- ئەتابیك نەصرەت الدین ئەحمەد كوڕی یوسف شا:

فەرمانڕەوایی لوڕی گەورەی كرد، لە دوای كوژرانی ئەتابیك ئەفراسیاب هاتە سەر حوكم و ماوەی سی و هەشت ساڵ حوكمی كرد و لە ساڵی ١٣٣٢ ز مرد[٤٣].

### *٤- دەربارەی دیالێكتی كوردی

دابەشكردنی دیالێكتەكانی زمانی كوردی لەلایەن زانا و نووسرانەوە بە زۆر جۆر دابەشكراوەو هەندێكیان بە پێی شوێن و ناوچەی جوگرافی و هەندێ بە پێی عەشیرەت و هۆزەكانەوە و هەندێ بە شێوەی جیاوازی دی.. لەر لە هەموویان ئەمیر شەرەفخانی بەتلیسی لە ئاخر و ئۆخری سەدەی دەهەمی كۆچیدا زمانی كوردی بەسەر ئەم دیالێكتانە دابەش كردووە[٤٤]:

١- كرمانجی

٢- لوڕی

---

(٤٢) فوئاد حەمە خورشید، اللغة الكردیة، ص٢٠.

(٤٣) دیالێكتەكانی زمانی كوردی، ل٤٤.

(٤٤) شایانی باسە دكتۆر(مەكەنزی)یش لەم دیفتۆنگە دواوە بڕوانە:

D.N. Mackanzie, Kurdish Dialect Studies, London,1961,p28.

هەروەها بڕوانە: د. مەكەنزی: شێوەزاری هەولێرێ، هیمدادی حوسێن وەریگێڕاوە، گۆڤاری رۆژی كوردستان، ژمارە٧٠، ساڵی ١٩٨٥.

٣- کەڵهوڕی(کەلوڕی)

٤- گۆران

هەروەها فوئاد حەمە خورشید وای دابەش کردووە[٤٥]:

١- کرمانجی سەروو

٢- کرمانجی ناوەڕاست

٣- کرمانجی باشوور

٤- گۆرانی

به هەرحاڵ وەك پێشتر گوتمان مادام لوڕەکان کورد بن، دیالێکتەکانی زمانی کوردیش هەرچۆنێك دابەش بکرێت، دەبێ دیالێکتی لوڕیش یەکێ بێ لە دیالێکتەکان لەڕووی زمانەوانی و ڕێزمانیشەوە، گومانی تێیدانییە تا ئێستا لێکۆڵینەوەیەکی بە پێز و تەسەل نەکراوە.

## * ٥- چەند سەرنجێکی ڕێزمانی لە دیالێکتی لوڕی:

١- لە دیالێکتی لوڕیدا دەنگە بزوێنەکان هەمان دەنگە بزوێنەکانی دیالێکتەکانی زمانی کوردین، تەنها(و) کە ئەم بزوێنە واوێکی قوچاوە واتا دیفتۆنگێکە لە بزوێنی واوی درێژ بە لای بزوێنی (ی)دا دەشکێتەوە: بۆ نموونە:

بێم- بووم، بێت- بووت...[٤٦]

هەروەها دەنگی بزوێنی(وێ)کە دیفتۆنگێکە لە لوڕیدا بەرچاو دەکەوێت وەك: خوێن XON[٤٧]

هەروەها دەنگی(ۆ)، زۆر کەم دەبیسترێ.

(٤٥) فەرهەنگی لەك و لوڕ، حەمیدی ئێزەد پەناهە ، ل٢١٨.

هەروەها بڕوانە: دیالێکتەکانی زمانی کوردی، ل٥٠.

(٤٦) هیمدادی حوسێن، نیشانەکانی کۆ لە زمانی کوردیدا، ل١٠٩.

(٤٧) دیالێکتەکانی زمانی کوردی، ل٤٩.



دەنگە نەبزوێنەکانیش هەمان شێوەی دیالێکتەکانی دیکەیە.

٢- زۆربەی سەرچاوە ڕێزمانییەکان باسی نیشانەی (کۆ)یان کردووە لە دیالێکتی لوڕیدا، بەوەی کە (و، یا)یە[٤٨]

وەك: کوڕ: کوڕو (کوڕان)

دار: داریا (داران)

بەڵام نووسەری ئەم گوتارە باسی نیشانەی(ان)یشی کردووە و نموونەی بۆ هێناوەتەوە.

٣- جێناوەکان:

١- جێناوە جوێیەکان:

مە، تو، ئەو، ئێمە، ئیو/ وان

٢- جێناوە لکاوەکان:

ئەوانەی لەگەڵ ناو دێن:- -م، -د، ی/-مان،- دان،- یان ئەوانەی لەگەڵ کار دێن: سم،- د، (،- ێ)،- ین، - ن،- ن.

## *٦- چاو پێخشاندنێکی خێرای فۆلکلۆر و ئەتنۆگرافیای لوڕستان:

دەربارەی فۆلکلۆری لوڕستان جارێ گەنجینەیەکی نەشکاوە و بە خوێنەری کورد نەناسێنراوە. جا ئەگەر فۆلکلۆر بنچینەیەکی پتەوی پتەوی ئەدەبی نووسراو بێت و واقیعی ژیانی کۆمەڵ وەدەربخات و ئاوات و ئارەزووەکانی کۆمەڵی تێیدا دەربکەوێت. ئەڵبەتە، کە باسیش دێتە سەر لوڕستان دەبێ لە فۆلکلۆری لوڕستانیش بکۆڵینەوە، بەڵام بە هۆی ئەوەوە، کە شتێکی ئەوتۆی لێنەکۆڵراوەتەوە و بڵاونەکراوەتەوە و سەرچاوەی پێویستمان لە بەردەستدا نییە، بە ناچاری چەند نموونەیەك دێنینەوە:

(٤٨) ئەوەندەی من ئاگام لێبێ، ئەم نووسینانە دەربارەی فۆلکلۆری لوڕی بڵاوکراونەتەوە.

١- مدحی مەندەلاوی، شاکە، خان مەنسوور، گۆڤاری کاروان، ژمارە ١٦، ١٩٨٣، ل٧٣.

٢- محسن بنی ویس علی، پەندی پێشینان لە زاری رووسیاییدا، گۆڤاری بەیان، ژمارە١١١، ١٩٨٥، ل٧١-٧٥.

ا- چەند نموونەیەك لە پەندی پێشینانی لوڕ:

١- ئەگەر عەقڵ نەباشەد جان دەر عەزابەست.

٢- لەقمەی قەوی هەم دەم درد هەم قنگ.

٣- چەم بێ چەقەل نییە و[٤٩].

٤- کی مەگو، ماسم ترشە؟

٥- قەلاق بە قەلاق مەگو، روود سیاهە[٥٠].

ب- چەند نموونەیەك لە مەتەڵی لوڕی:

١-مشتی زڕات دامە ولاٚت. (ئەستێرە)

٢- تەڕی کەی بەلی کەی بەیدەی خۆ دوی دەری کەی. (کەوچك)

٣- خالۆم لەیلا کەفتیە دو گونی لەولا کەفتیە (دەستاڕ)[٥١].

ج- نموونەیەکی هۆنراوەی فۆلکلۆری لوڕی:

| | |
|---|---|
| بالاٚکەت بەرزە چەنە چناری | ئەو هەفت ئیمامە بەدەورت ناری |
| کوور بووت ئەو دیدە تو نیشانمدا | نان بەدبەختی وەداوانم نا |
| ئێوارە دیمت وەو جەلالەوە | خولکەم نەکەردی چیتە مالەوە |
| بیلا هەر شەو بووت لەروژ بیزارم | تەقسیرم نییە عاشقی زارم |
| سەمانگە زمسان گشتی شەو بیات | دەم وەنەو دەم چوو وەخەو بیات |
| ئیمشەو چەن شەوە تالار بی نازە | نەکزەی کەوەو نە دەنگسازە |
| ئەر بییتە پیم ماچ لەنەو دەم | رۆژی چوار جار قەزات لەخوەم[٥٢] |

(٤٩) ئەم پەندانەم لە عامر قادر وەرگرتووە، کەدانیشتووی خانەقینە، لە١٩٨٥.

(٥٠) محسن بنی ویس علی، پەندی پێشینان لەزاری رووسیاییدا، ل٧٣.

(٥١) ئەم مەتەڵانەم لە(عامر قادر) وەرگرتووە، کەبرا لوڕەکانی خانەقینە، لە ١٩٨٥.

(٥٢) د. محەمەد مکری، گورانی یا ترانەهای کردی، ص ١٥-١٦.



د- دەربارەی بووك گواستنەوە و پرسە و هەندێ لایەنی دی

وەك زۆربەی ناوچەکانی کوردستان  بووك گواستنەوە هەمان ڕێ و شوێونی لە لای برا لوڕکاندا هەیە. ئەو هەڵپەڕکێیەی  زۆر باوە لە ناوچەی خانەقین و مەندەلی (فەتاحی)یە. بۆ تازییە و پرسە دانانیش بۆ پیاوان (٣)  ڕۆژ. بۆ ژنان (٥) ڕۆژە، هەروەها لە ڕۆژی جەژنیشدا مەولوود بۆ مردووەکانیان دەکەن و ڕەنگە ئەمە لە (٢) جەژن زێتریش دووبارە بێتەوە، خاوەن تازییەکانیش ئێواران تا (٤٠) ڕۆژ خواردن بۆ مزگەوت دەبات یان زێتر. لوڕەکان عەشرەتیان زۆرە، لەوانە:

١- دەلۆ

٢- باجەلان

٣- سوێرە مەیری

٤- زەهاوی

٥- وەندی

٦- ئەرکەوازی

٧- کارێز

٨- قەرەوڵس

٩- جمهوور

١٠- کێوە گێلو (کوهگەلو)

١١- مامەسانی..

لەڕووی ئایینەوە گەر لە ئایینی کۆنی لوڕەکان بدوێین، ئەوا مادامەکێ لوڕەکان بە پاشماوەی کاسییەکان، یان کاشییەکان دادنێین دەبێ ئایینەکەیشیان لەوێوە دەست پێ بکەن.

کاشییەکان ناوەکەیان لە ناوی خواکەیانەوە هاتووە، کە ناوی(کاش) یان (کاشو) بووە (٥٣)، دوای ئەوە ئەو گەڵە وەك زۆربەی گەلاٚنی دیی هاوسێ بە ڕۆژپەرستی، مانگ پەرستیدا.. تێپەڕیون، بەڵام ئەمڕۆ زۆربەی لوڕەکان بوونەتە ئیسلام و لەسەر مەزهەبی شیعەن و هەندێکیشیان لەسەر مەزهەبی(علی اللهی)ن[٥٤].

(٥٣) ئی. م. دیاکۆنۆڤ، میدیا، وەرگێڕانی: بورهان قانع، بەغدا: ١٩٨٧،ل١٩٦.

(٥٤) محمد امین زکی، کورد و کوردستان، ل١٧.

# سەرچاوەکان:


## أ- بە کوردی

١- ئی. م. دیاکۆنۆڤ: میدیا، وەرگێرانی: بورهان قانیع، بەغدا، ١٩٧٩.

٢- جەمال نەبەز (دکتۆر): کورتە مێژوویەکی کوردناسی لە ئەڵمانیادا، گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی دووهەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٤.

٣- حەمیدی ئێزەد پەناه : فەرهەنگی لەك و لوڕ، لێدوانی مەحموود زامدار، بەغدا، ١٩٧٨.

٤- حسێن حوزنی موکریانی: مێژووی شاهەنشاهانی کوردی زەند، رەواندوز، ١٩٣٤.

٥- دیالێکتەکانی زمانی کوردی(ئامادەکردن)، هەولێر ١٩٨٣.

٦- زبیر بلال اسماعیل: مێژووی زمانی کوردی، وەرگێرانی: یوسف رەئوف علی. بەغدا، ١٩٨٤.

٧- شرفخانی بدلیسی: شەرەفنانە، هەژار کردوویە بە کوردی، بەغدا، ١٩٧٣.

٨- عبدالرحمن محمد امین زەبیحی: قاموسی زمانی کوردی (پێشەکییەکەی)، بەرگی یەکەم، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٧.

٩- کەریم زەند: میللەتی کورد، سلێمانی، ١٩٧٠.

١٠- کەمال فوئاد (دکتۆر)، زاراوەکانی زمانی کوردی و زمانی ئەدەبی و نووسینیان، گۆڤاری زانیاری، ژ ٤، بەغدا، ١٩٧١.

١١- قەناتی کوردۆ، هەندێ بیروباوەڕی هەڵە لە بارەی زمان و مێژووی کوردەوە، وەرگێڕانی: د. ئەوڕەحمانی حاجی مارف، بەغدا، ١٩٧٣- ١٩٧٤.

١٢- قانع، لوڕی بچووك، گۆڤاری، رۆژی نوێ، ژ ١٢، ساڵی ١٩٦٠.





١٣- گۆڤاری گرشەی کوردستان، ژ ٣، کۆزانی فەرهەنگی زمانی کوردی، تاران، ١٩٨١.

١٤- مەکەنزی، شێوەزاری هەولێری، وەرگێرانی: هیمدادی حوسێن، گۆڤاری رۆژی کوردستان، ژ، ٧٠، ١٩٨٥.

١٥- مدحی مەندەلاوی، شاکە و خان مەنسوور، گۆڤاری کاروان، ژ١٦، ١٩٨٣.

١٦- محمد امین زکی، کورد و کوردستان، چاپخانەی دار السلامی بغداد، ١٩٣١.

١٧- مسعود عزالدین ساڵەیی، لوڕ و بەختیارییەکان، گۆڤاری، رۆشنبیری، نوێ، ژ ١٠٦، ١٩٨٥.

١٨- محسن بنی ویس علی، پەندی پێشینان لە زاری رووسیاییدا، گۆڤاری، بەیان، ژ ١١١، ١٩٨٥.

١٩- هیمداد حوسێن، نیشانەکانی کۆ لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ، ١٠٦، ١٩٨٥.

## ب- بە عەرەبی:

٢٠- تومابوا، مع الاكراد، ترجمة، محمد شريف عثمان، النجف، ١٩٧٣.

٢١- جمال وديعي، قبائل و عشائر اللور، مجلة الثقافة، ع، ١٢،١١،١٩٨٠

٢٢- حسين احمد الجاف، لقاء مع حفيد الوالي الاخير لمنطقة لورستان، مجلة شمس كردستان، ع، ٦٦ لسنة ١٩٨٤.

٢٣- زبير بلال اسماعيل، تأريخ اللغة الكردية، بغداد، ١٩٧٧.

٢٤- شاكر خصباك (الدكتور)، الاكراد دراسة جغرافية اثنوغرافية، بغداد، ١٩٧٢.

٢٥- عبدالرحمن قاسملو (الدكتور)، كردستان والاكراد، ط١، بيروت، ١٩٧٠.

٢٦- علاء نورس (الدكتور): العراق في العهد العثماني دراسة في العلاقات السياسية، بغداد، ١٩٨٤.

٢٧- علی سيدو الگورانی، اللر و لرستان، مجلة المجمع العلمي الكردي، المجلد الثاني، العدد الثاني، ١٩٧٤.

٢٨ - فؤاد حمه خورشيد، اللغة الكردية التوزيع الجغرافي للهجاتها، بغداد، ١٩٨٣.

٢٩- فؤاد حمة خورشيد، لرستان الاقليم الجنوبي من كردستان ايران، مجلة شمس كردستان، ع، ٦٦، ١٩٨٤.

٣٠- محمد جميل بندى الروزبيانى، بندنيجين (مندلى) فى التأريخ قدياً وحديياً، مجله المجمع العلمى العراقى (الهيئه الكرديه)، المجلد السابع، ١٩٨٠.

## پ- به فارسی:

٣١- احسان نوری پاشا، کرد و کردستان یا تاریخ ریشه نژادی کرد، تهران، ١٣٣٣

٣٢- رضا شاه کبیر، خاطرات رضا شاه کبیر، تهران، ؟

٣٣- رشید یاسمی: کرد و نژاد و پیوستگی او، تهران، ١٣٣٥.

٣٤- صدیق صفی زاده: فرهنگ ماد، جلد اول، چاپ اول، تهران، ١٣٦١.

## ت - به ئینگلیزی:

35- D.N. Macanzie, Kurdish Dialect Studies, London,1961.

## ١- لەمەڕ وشەی نەورۆزەوە:

(نەورۆز) وشەیەکی لێکدراوە، پێك هاتووە لە (نەو+ رۆز): واتـا نـوێ رۆژ یـان رۆژی نوێ، هەر بەم ناوەش (نـەورۆز) لـە زمـانی کـوردی و عـەرەبی و هینـدی و ئەفغانیدا و.. بەکاردێت. ئەمەش هەر وەك لـە یەکـەم سـەرنجەوە نیـشانەیەکە بـۆ کۆنی و دێرینی ئەم جەژنە.

دەربارەی ئەوەیشی، کە بۆچی پێی گوتراوە (نـەورۆز) یـان (رۆژی نـوێ) بـیروڕای جۆراوجۆر لە گۆڕێیە.

(الراغب) لە (محاضرات الادباء)دا دەڵێ:

((لە بارەی بنەمای نەورۆز و میهرەجانەوە (المأمون) جارێکیان پرسی:

(ئەم دوو جەژنە لە چییەوە داکەوتووە؟ کەس هیـچی لێ نازانـێ، خـۆی وتـی: دەگێڕنەوە، کە پەروێز هەموو ناوچەکانی لە ئاریا زەمیندا ئـاوەدان کـردەوە و لـە رۆژی نەورۆزا ئـەمن و ئاسایـشی لەولاتـدا چەسـپاند، بۆیـە نـاوی ئـەو رۆژەیـان نا نەورۆز)[٥٥].

دەربارەی وشەی نەورۆز(فەرهەنگی خاڵ)[٥٦] نووسیویەتی: (نـەورۆز) یەکـەم رۆژی بەهارە کە رێکەوتی بیست و یەکی مارت ئەکا. لە کوردستانی تورکیاشدا، سەرباری

---

(٥٥) شوکور مستەفا: نەورۆز لە ئەدەبی گەلاندا، گۆڤاری دەفتەری کوردەواری، بەرگی دووەم، مارت- نیسانی ١٩٧٠، بەغدا، ل٤٤-٤٥.

(٥٦) خاڵ، شێخ محەمەد. فەرهەنگی خاڵ، جزمی سێهەم، سلێمانی، ١٩٨٠، ل٣٥٨.



وشەی نەورۆز (جەژنی توولی دان) کە سووك کراوەی (تول هلدان)ەشی پێـدەڵێن و لـە کوردیدا بە واتای (تۆڵەسەندن) دێت)[٥٧].

لە دوای ئیـسلامەتیش بـۆ ئـەوەی لەگـەڵ مەزهـەبی تازەیانـدا بگونجێـت(خـدر نەبی)یشیان پێ گوتووە، چونکە حەزرەتی خدر بەوە ناسراوە کە لـە کـاتی تەنگانـە و دژواردا بە هانای خەڵکییەوە دێت، جائەوانیش وای بۆ چوونە کە ئـەو بـە هانایانـەوە هاتووە، لەو شەوەدا لە هەموو ماڵێکدا بۆ رێزی ئەو بە هانا هاتنەی حـەزرەتی خـدر دوو چرایان دادەگیرساند و تا بەرە بەیان نەیان دەکوژاندەوە تاوەکو ئەو حەزرەتـە بـە پێیـە پیرۆزەکـانی خـۆی سـەر کـا بـە ماڵیانـدا و بەرەکـەتیان پێببەخـشێ. ئەرمەنەکانیش، کە هاوخاکی کوردستان بوونە، لەگەڵ کوردان ئەم ئاهەنگەیان گێڕاوە لە ساڵنامە ئەرمەنییەکاندا بە (ئایینی ئاراج) و (تەرانداز) ناوی هاتووە و بە جـەژنی کوردە یەزیدییەکانی دەزانن)[٥٨].

(عومـەر خـەیام)یـش لـە (نەورۆزنامـە)کەیـدا نووسـیویەتی: (ئـەو رۆژەی کـە فەرەیدونی کورد زوحاکی ئەسیر کرد(ئەو هەرێمە)ی لە شەڕی ئەو رزگار کرد و بوو بە جەژن)[٥٩]. هەروەها (عەلی اصغر شمیم)یش نووسەری کتێبی(کوردستان)لە کتێبەکەی خۆیدا نووسیویەتی: لە نێـوان کوردەکانـدا جـەژنێکی کـوردی هەیـە، کـە ئاهـەنگی تایبەتی بۆ دەکەن بە بۆنەی لە ناوبردنی زوڵمـی زوحـاك بـە دەسـتی فەرەیـدون، کـە رەنگە ئەمەش بەڵگەیەك بێ بۆ راستی نووسینەکانی نێو شانامەوە)[٦٠].

سەرباری ئەم بیروڕا جوداوازانەی لەمەڕ نەورۆزی گوتراون، جوداوازی لەسەر رێکەوتی نەورۆزێش هەیە.

---

(٥٧) پاشا، احسان نوری: کرد و کردستان یا تاریخ ریشه نژادی کرد، ١٣٣٣ شمسی، ص٤٨.

(٥٨) هەر ئەوێ، ل٤٩.

(٥٩) هەر ئەوێ، ل٤٨.

(٦٠) هەر ئەوێ، ل٤٨.

(تۆما بوا) دەڵێ:
( ڕێکەوتی یەکەم چوارشەممەی مانگی نیسان دەکات.)[٦١] هەروەها (Morier) لە سیاحەتنامەی خۆیدا نووسیویەتی:

(لە ساڵی ١٨١٢ی زایینی لە ٣١ی مانگی ئاب خەڵکی دەماوەند بە بۆنەی ڕزگاربوونیان لە زوڵم و ستەمی زوحاك جەژنێکیان هەبوو، ئەو جەژنەشیان ناونابوو(عید الکردی)- جەژنی کوردی)[٦٢]. بە هەرحاڵ زۆربەی بیروڕایەکان لەسەر ئەوەن، کە لە (٢١)ی مارتدا دەبێت، ئەمەش زێتر جێگەی باوەڕە، چونکە سەرەتای ساڵی نوێیە و بەهار دەست پێدەکات و سەرما و سۆڵەی زستان کۆتایی دێت و زەوی دەبوژێتەوە، ئەمەش بۆ ئەم سەردەمە دێرینە کە چاندن و دانەوێڵە ماکی سەرەکی و داهاتی سەرەکیان بوو گرنگییەکی زۆری بووە، وەك تۆما بوا دەبێژێ: (لەناو ئێرانییە کۆنەکاندا ئەو ژنەی کە بۆ سەردان دێت ئەچێتە لای عەشتار و بابلییەکانیش ئەچنە لای عەشتەرون، ئەبێ ئامانجی پێکهێنانی ئەم ئاهەنگە یارمەتیدانی هەموان و خوای (بە پیت) بێت بۆ سەرکەوتنی دروێنەی ئەو ساڵە)[٦٣].

## ٢- نەورۆز و ئەفسانە:

ئەفسانە هەوڵدانی مرۆڤە بۆ ئەوەی بتوانێ لە نهێنی شتەکانی دەوروبەر و گەردوون تێبگات، ئەم زانستەش هەوڵ دەدات بە هۆی ئەفسانەوە وەك کەرەستەیەك لە بیروباوەڕ و ئایین و داب و نەریتی کۆن بگات پێی دەگوترێت (میتۆلۆژیا) نامەوێ دووبارە باسی ئەفسانەی کاوە و زوحاك یان ئەژدیهایەك بکەم، هەموو ئەوە دەزانین، تەنانەت ئەم ئەفسانەیە وای لە هەندێ نووسەر کردووە بیروڕای زۆر بێ سەر و پێ و

(٦١) تۆمابوا: ژیانی کوردەواری، وەرگێڕانی: حەمە سەعید حمە کریم، بەغدا، ١٩٨٠، ل١٥٥.
(٦٢) تابانی، حبیب الله: بررسی اوضاع طبیعي، اقتصادی و انساني كردستان، چاپ دوم، ص٨٩.
(٦٣) تۆما بوا: ژیانی کوردەواری، وەرگێڕانی: حەمە سەعید حمە کەریم، بەغدا، ١٩٨٠، ص١٥٦.



نازانستی دەربڕن، کە تەنها لە ڕوانگەی سۆزییەوە و هیچی دی.. چاوگێڕانێکی خێرا بە مێژووی کۆنی ئەو ناوچەیەدا ئەوە دەردەخات کە پاشایەك بەم ناوە بەر دیدە ناکەوێت، ئەمە سەرباری ئەوەی، کە ناوی (کاوە) بە دەگمەن دەبینرێ و بەڵکو زۆربەی سەرچاوەکان ناوی(فەرەیدون) یان (ئەفرەیدون) دەبەن، بەڵام ئەوەی کە جێگای شانازیو گومان لێ نەکردن بێت ئەوەیە، کوردیش وەك گەلانی تری ناوچەی ڕۆژهەڵات ئەگەر زیاتر نەبێ کەمتر نییە بەشی لە نەورۆز و تەنانەت نەورۆز لە کنی بۆتە ڕەمزێکی نەتەوەیی و خۆگری، گوڕتر و گەرمتر یادی ئەو ڕۆژە لە پاڵ میللەتانی دی دەکاتەوە زیاتریش شانازی پێوە دەکات.

## ٣- ئاهەنگ و نەریتی نەورۆز:

ئەڵبەتە، وەك مرۆڤ و بیروباوەڕەکانی لە پێشکەوتن و گۆڕانی بەردەوام دان، بە تێپەڕبوونی کات ئاهەنگی نەورۆزیش بەرە بەرە لە کۆنەوە تاوەکو ئەمڕۆ گۆڕانی بە سەردا هاتووە، ئەمە جگە لەوەی بوونی دەسەڵاتێکی سیاسی لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی دی کاری کردۆتە سەر ئاهەنگ گێڕانی نەورۆز. بۆ نموونە: لە زۆر زوودا وەك کتێبی (ژیانی کوردەواری) ئاماژەی بۆ کردووە و دەڵێ: **(کاتی خۆی بڕیاریان داوە لە جەژنی نەورۆز خێرێك بکەن و پێی گوتراوە (قاشوق زانی) و شۆربایەکی لێ دروست کراوە بەو نیازەی کە بە درێژایی ساڵی داهاتوو تەندروستییان باش بێ، بەڵام ئەم ڕەوشتە کۆنانە وردە وردە خەریکە نامێنن)**[٦٤].

هەر لەو کتێبەدا باسی گەلێ خوڕەوشتی دی و نەریتی نەورۆز و ئاهەنگ گێڕان کراوە.

هەروەها (کامەران موکری)ی شاعیر دەڵێ: کاتی خۆی ئێمە لە نەورۆز لە ساڵانی ٤٧-١٩٤٨دا ئاهەنگی خۆشمان بۆ نەورۆز گێڕاوە و پیرەمێردی شاعیریش بەشداری کردووە و هەر لەو کاتەش بووە سروودی نەورۆزی لەسەر داوای ئێمە (گەنجانی ئەوکاتە) داناوە و چونکی پێویستمان بە سروودێکی نەتەوایەتی کوردیی

(٦٤) هەر ئەوێ، ل١٥٥.

هەبوو بگوترێتەوە. باسی ئەوەی بۆ کردین کە کۆمەڵێ گەنج هەریەکەی مەشخەڵێکیان بە دەستەوە گرتبوو و بە نێو بازاڕدا سووڕاونەتەوە بەم بۆنەیەوە خەڵکێکی زۆریان کۆکردۆتەوە و گوتە و شیعر و شتی دیان بۆ خوێندوونەتەوە. ئەمە جگە لەوەی پیرەمێردی نەمر بێجگە لەوان خۆی لە گردەکەی مامە یارە ئاهەنگی نەورۆزی سازداوە[٦٥].

ڕەنگە ئەمە بە پێی ناوچە جوگرافییەکان لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی دی جیاوازی هەبووبێ[٦٦]. چونکە هەر دوور نەڕۆین باوکم پێی گوتم: **(جاران لە گوندەکەمان ئاغا قەبوولی نەدەکرد ئاگر بکرێتەوە و ئاهەنگ بەم بۆنەیەوە بکرێتەوە، ئەمەش نیشانەیەکی دی بۆگەنایەتی ڕژێمی دەرەبەگایەتی گۆڕ بە گۆڕ وەدەردەخات)**[٦٧].

ئەمڕۆش ئاهەنگی نەورۆز بە دڵشادییەوە دەکرێتەوە و ئاهەنگ ساز دەکرێ، وەلێ بە داخەوە ئاگرەکەیش بە تایەی ترومبێل و شتی دی لە نێو بازاڕ و شەقامەکاندا دەکەنەوە، کە ئەمەش جگە لە پیسکردنی ئاو و هەوایەکە هیچی دی نییە[٦٨]. دەربارەی ئەو ئاگرەش بیروڕا و بۆچوونی جیاواز لە ئارادان. هەندێ لەو باوەڕەدان، کە ئەم ئاگرە لە ئایینی کۆندا ڕەمزی ڕووناکی و چاکەیە.

(٦٥) موحازەرەکانی خوالێخۆشبوو کامەران موکری لەکۆلیجی ئەدەبیات- زانکۆی سەلاحەدین، ١٩٨٥، (مامۆستا لە١٩٨٦ کۆچی دوایی کرد).

(٦٦) دەربارەی ئاهەنگ گێڕانی نەورۆز لە١٩٤٦ لە هەولێردا، عاصم حەیدەری گوتارێکی بەم ناو نیشانە (لاپەڕەیەکی شاراوە لەمێژووی خەباتی نەتەوایەتی شاری هەولێر بیرەوەری ئاهەنگی نەورۆزی ١٩٤٦) لەدەفتەری کوردەواری، مارت- نیسانی ١٩٧٠دا بڵاو کردۆتەوە.

(٦٧) باوکم: (حسین بکر حسن) باسی یەکێ لەئاغاکانی یەکێ لەگوندەکانی کەندێناوەی بەم شێوەیە دەکرد.

(٦٨) دەربارەی ئەم دیاردەیە محەمەدی مەلا کەریم لە ڕۆژنامەی (العراق) ژمارە(٢٧٩٦)، ڕۆژی ١٠/٤/١٩٨٥، نووسینێکی بەناوی خەڵکینە ئاگری نەورۆز وانابێ! بڵاو کردۆتەوە.



هەندێ دەڵێن: کاتی خۆی بە هۆی زۆرداری زوحاکەوە ئەو خەڵکە کە پەڕاگەندە ببوون بە لادێ و بە دۆڵەکاندا ئەم ئاگرە لە شوێنێکی بەرز کرایەوە بۆ ئەوەی خەڵکەکە ئاگادار بکرێنەوە پاشان زوحاك رووخا و زۆرداری نەماوە و نیشانە بووە بۆ ئەوەی ئەوان بگەڕێنەوە بە هەر حاڵ من زێتر دان بە بیروڕای یەکەمدا دەنێم، بیروڕای دیکەش هەن بۆ نموونە لەوانە:

محەمەد تەیمور دەڵێ: (کاوە هێمای هاتنە دیی قۆناغێکی نوێی کشتوکاڵ و کەرەستەی بەرهەم هێنانە دی نوێ و هێمای دۆزینەوەی مەعدەن و مەنجەمی شاخەکانە، بەڵام ئاگر هێمای مەعدەن سازی و تەقسی ڕێکخراوەیەکی نهێنی بووە دەبێ پەرستنی چوار توخمە سەرەکییەکان لە باو بووبێ واتە (ئاو، با، ئاگر، زەوی) کە مانای مێرد و گیان و ژیان و ئافرەتیش دەداتەوە)[٦٩].

(٦٩): محمد تیمور: نەورۆز و دراما و شانۆ، گۆڤاری ئۆتۆنۆمی، ژ١، س٩، ١٩٨٥، ل٨٧.

پێداچوونەوە و گەڕانەوە بۆ ڕەگ و ڕیشەی جەژنی نەورۆز، کارێکی قورس و ئەستەمە، چونکە لە یەکەم نیگاوە تا ئەوەندی عەقڵ لە مێژوودا بڕ بکات، بوونی خۆی دەسەلمێنێ، ئەگەر کورد لە بەرە بەیانی مێژووەوە ڕەگ و ڕیشەی بەم خاکەدا ڕۆچووبێ ئەوا بێگومان جەژنی نەورۆزیش وەکو دیاردەیەکی مەزهەبی و شارستانی بەشداری لە دروستبوونی عەقڵی ئینسانی کورددا دەکات.

هەروەکو زۆربەی مێژوونووسەکان ئاماژە بۆ ئەوە دەکەن، کە ڕیشە و نەژادی کورد دەگەڕێتەوە بۆ میللەتە سەرەتاییەکانی چیاکانی زاگرۆس، بەتایبەتی (گوتی، لولوپی، کاسییەکان) ئەگەر لە کاتێکدا ئەمە ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگر بێت و بە پشتیوانی پاشماوە و دیکۆمێنتە ئارکۆلۆژییەکان ئەو حەقیقەتە ڕوون بکرێتەوە، ئەوا بێگومان بەر لە کۆچی ئارییەکان لە ناوەڕاستی هیندستانەوە لە ١٨٠٠- ١٥٠٠ پ.ز بۆ چیاکانی زاگرۆس، ئەو میللەتانە قەوارەی تایبەتی خۆیان هەبووە و بەتایبەتی لە سەردەمی کاسییەکان، کە تا ناوچەی شارەزووریشی گرتبۆوە و سەرزەمینی ئەمڕۆی کوردستان مەڵبەندی مەعدەن سازی و پێشکەوتنی بیری ڕۆژهەڵاتی بووە، لەم ڕووەوە دەکرێ ئاماژە بۆ کتێبە بە نرخەکەی مێژوونووسی سۆڤیەتی دیاکۆنۆڤ (مێژووی ماد- میدیا)بکەین، کە پاشماوەکانی ئەوان لە چاو شارستانیەتی دۆڵی نیل و ناوچەکانی دی چەندە پێشکەوتوو بووە.

لە قۆناغی دوای ئەوەش، لە سەردەمی دەوڵەتی میدیادا ئاگری نەورۆز تێکەڵ بە چەمك و بونیادی دەوڵەت و مەزهەبی ئەو سەردەمە (زەردەشتی) بووە و لە هەمان کاتدا ڕەنگە لە دید و ڕوانگەیەکی ئابوورییەوە، نیشانەی قۆناغێکی نوێی پیشەسازی بووبێت. هاوکات لەگەڵ ئەوەشدا بۆتە مایەی ڕووناکی و هێزی چاکە و پیت و بەرەکەت بۆ ژیانی مرۆڤ.



پاشان لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئایینی ئیسلامیش، جەژنی نەورۆز و گڕە بەتینەکەی لە دڵ و دەروونی کورددا نەکوژایەوە و بووە سرووتێك و تێکەڵ بە بەها ڕۆحییەکانی ئینسانی کورد بوو، ئەمجارەیان لەگەل ڕێ و شوێن و مەراسیمی تازەدا گونجاندیان، بە شێوەی (خدری زیندە) دەرکەوت و تەنانەت نەوەکو هەر لە لای کورد، لای میللەتانی هاوژیان و هاوسێی کوردیش، بە تایبەتی لای ئەرمەنەکانیش بووە ڕەمزی تۆڵە سەندنەوە و بەرخودان.

لە ڕۆژگاری نوێی ململانێی ئایدۆلۆژیا و خەباتی نەتەوەییدا نەورۆز بووە ڕەمز و سیمبولێکی نوێ بۆ کۆڵنەدان و مقاوەمەت. لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانی و پاشان لە سەردەمی ڕژێمی پاشایەتی لە عێراقدا هەمیشە ڕژێمەکانی عێراق کۆسپ و تەگەرەیان لەبەردەم ئاهەنگ گێڕانی نەورۆزدا دروست دەکرد و نەفی ئەو جەژنە نەتەوەیی و مەزهەبییە دێرینەیان دەکرد.

## نەورۆز و ڕاپەڕین:

ئەگەر نەورۆز، لە ڕووی پێکهاتن و واتای فەرهەنگییەوە گوزارشت لە (ڕۆژێکی نوێ) و لە (ڕاپەڕین)ی خەڵکی ستەمدیدە بکات لە چەمکی سیاسییەوە، بێگومان چ لە ڕۆژگارە دێرینەکان و چ لە سەردەمی نوێدا ئەوەندەی تێکەڵ بە خەبات و سیاسەتی کورد بووە لە واتا و بەها مەزهەبییەکەی تەجرید بووە. بە پێی ئەو ئەفسانەیەی کە لە شانامەی فیردەوسی و کتێب و سەرچاوە مێژووییەکانی دواتردا هاتووە.

(ئەفرەیدوون، کاوە) بوونە ڕابەری ئەو خەڵکە لە بەرەنگاربوونەوە و سەرنگومکردنی دەستەڵاتی ڕەش و نەهامەتی ئەو ڕۆژگارە و لەوە زیاتر نەیانتوانی سەرنەوی و مل کەچی زەبر و زەنگی زوحاك بن، ئەگەر (زوحاك) ڕەمزێك بێت بۆ باڵا دەستی و زەبر و زەنگ، ئەوا لە نەورۆزدا بووە دەرسێك بۆ کۆمەکی و هاوکاری بێ سنووری خەڵکی کلۆڵ.

لە ڕۆژگاری نوێشدا، لە نەورۆزی (١٩٩١)دا، لەگەڵ گەرمەی ڕاپەڕینی خەڵکی کوردستاندا بە ڕووی زوحاکی نوێی سەردەمدا، دیسانەوە تەبایی و یەك ڕیزی خەڵکی



شێخ مەحموودی حەفید





شەریف پاشای خەندان نوێنەری گەلی کورد لە کۆنگرەی ئاشتی پاریس١٩١٩



**حەسەنی ئەرفەع نووسەری کتێبی (کورد لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی مێژوویی)**






**کتێبی (کورد لێکۆڵینەوەیەکی سیاسی مێژوویی)**



ئالآی کۆماری دێمۆکراتی کوردستان ١٩٤٦



# KURDS
# TURKS AND ARABS

*POLITICS, TRAVEL AND RESEARCH IN*
*NORTH-EASTERN IRAQ*
*1919–1925*

BY

C. J. EDMONDS
C.M.G., C.B.E.
*Adviser to the Ministry of the*
*Interior Iraq, 1935–1945*

*LONDON*
OXFORD UNIVERSITY PRESS
NEW YORK TORONTO
1957

وێنەی بەرگی کتێبی (کورد تورك عەرەب) ی ئەدمۆندس



Grammar

of the

Kurmanji or Kurdish Language

By

E. B. Soane

Author of 'To Kurdistan and Mesopotamia in Disguise', etc.

LONDON
LUZAC & CO.
PUBLISHERS TO THE INDIA OFFICE
46 GREAT RUSSELL STREET
1913

وێنەی بەرگی کتێبی (ڕێزمانی کرمانجی یان زمانی کوردی) سۆن





TWO YEARS IN
KURDISTAN
Experiences of a Political Officer
1918-1920
by
W. R. Hay
Captain, attached 24th Punjabis,
Political Dept., Government of India

LONDON: SIDGWICK & JACKSON, LTD.
3, ADAM STREET, ADELPHI, W.C. 1921

وێنەی بەرگی کتێبی (دووساڵ لە کوردستان) کاپیتان های




وێنەی بەرگی کتێبی (کورد ) تۆماس بۆیس






(گەشتێکی شاراوە بۆ میزۆپۆتامیا و کوردستان) سۆن